# رۆڤار

ژمارە ٨٠

رۆڤار، بڵاوکراوەیەکی رۆشنبیرییە
هەر ژمارەی
تایبەتە بەداهێنەرێکی کورد
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم
دوو مانگ جارێک دەریدەکات

سەرپەرشتیار
ڕەووف بێگەرد

بەڕێوەبەری نووسین
کامەران سوبحان

دەرهێنەری هونەری
ئومێد محەمەد

دیزاینی بەرگ
ئارام عەلی

تایپیست
ئارام مەحموود

ناونیشان
سلێمانی- شارێی سالم
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

www.serdem.net

پەیوەندیکردن بەڕۆڤارەوە لەڕێگەی ئیمێڵی
Rovar.sardam@gmail.com
Rovar.facebook.com

چاپخانەی
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

نرخ: 1000دینار

ڕۆڤار لەلایەن کۆمپانیای
(بلاڤ پەیک)ەوە دابەشدەکرێت

## ژمارەکانی ڕابردووی ڕۆڤار

ئیبراهیم ئەحمەد، محەمەد مەولود (مەم)، کەمال مەزهەر، لەتیف حامید، سوارەی ئیلخانی زادە، محێدین زەنگەنە، ئەحمەد هەردی، یەڵماز گۆنای، ئیسماعیل بێشکچی، موحەرەم موحەمەد ئەمین، دڵدار، مەستورەی ئەردەڵانی، مەولانا خالیدی نەقشبەندی، جەمال عیرفان، مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، جەلالی میرزا کەریم، ڕەفیق چالاك، عەبدولخالق مەعروف، هێمن، حسێن حوزنی موکریانی، ئەمین فەیزی، کامەران موکری، جەلال تەقی، حەمە سالْح دیلان، هەژار، شاکیر فەتاح، کاکەی فەلاح، عەلائەدین سەجادی، شێخ محەمەدی خاڵ، حسێن عارف، عەلی ئەشرەفی دەروێشیان، سەلیم بەرەکات، پێشەوا قازی محەمەد، مەحموود مەلا عیزەت، فایەق بێکەس، عەبدوڵڵا پەشێو، جگەرخوێن، بابەتاهیری عوریان، عەرەب شەمۆ، دڵشاد مەریوانی، مەنسوری یاقوتی، حەسەنی قزڵجی، برایم ئەمین باڵدار، مەسعود محەمەد، بەختیار زێوەر، نەجمەدینی مەلا، مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی، لەتیف هەڵمەت، حاجی قادری کۆیی، پیرەمێردی نەمر، مەلا مەحموودی بایەزیدی، شێخ ڕەزای تاڵەبانی، شەریف پاشای خەندان، جەمیل صائیب، ئەحمەد موختار جاف، عەبدولڕەحیم ڕەحیمی هەکاری، میر شەرەف خانی بەدلیسی، وەفایی، گۆران، بەدیع باباجان، جەمال شارباژێڕی، مارف بەرزنجی، نالی، مەحوی، ئەنوەر قەرەداخی، حەمەی مەلا کەریم، سەید عەلی ئەسغەری کوردستانی، ئیبراهیم یونسی، قەرەنی جەمیل، مەلای گەورەی کۆیە، تۆفیق وەهبی بەگ، محەمەدئەمین زەکی، عەبدوڵڵا جەوهەر، مستەفا بەگی کوردی، شێرکۆ بێکەس، سالم، عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ، ئەحمەد کایا.

# پێڕست

# سەروتار

## شوكور مستەفا..

* ڕۆڤاری ئەم جارەمان تایبەتە بە نووسەر و وەرگێڕی بەتوانای كورد مامۆستا شوكور مستەفا. دەمێك بوو بیرۆكەی دەركردنی ڕۆڤارێك بۆ ئەم نووسەر و زمانزانە بەتوانایە لەبەرنامەی كارماندا بووە، تا لەم ژمارەیەدا دەرفەتەكە ڕەخسا. بە سوپاسێكی زۆرەوە كۆمەڵێك هاوڕێ و هاوكاری ڕۆڤار یارمەتیدەرمان بوون بۆ دەركردنی ئەم ژمارەیە و بڵاوكردنەوەی هەندێ لەو بابەتانەی شوكور مستەفا پێش مردنی نووسیونی و مەرگ ڕێگەی نەداوە بڵاویان بكاتەوە، لەم ژمارەیەدا بابەتی شوكور مستەفا بیبلیۆگرافیا و پێڕستی لە ناوەڕۆكی كتێبی كوردیدا بڵاوكردووەتەوە. ئەم بابەتە ڕێنیشاندەرێكی باشی خوێنەری كوردە، بۆ ناسینی بەرهەم و كتێب و وتارەكانی ئەم نووسەر و زمانزانە لەكتێبخانەی كوردیدا.

*بەدەر لەو وتارو نووسین و بابەتانەش كە لەم ژمارەیەدا لەسەر شوكور مستەفا نووسراون، دوو چاوپێكەوتنمان بڵاوكردووەتەوە، كە هەردووكیان لەكاتی خۆیدا سەرۆ قادر لەگەڵیدا سازیكردووە، چاوپێكەوتنێكیان شوكور مستەفا و مەسعود محەمەد و سەرۆ قادر لەسەر زمان و فەرهەنگ و كولتووری كوردی بە ڕاشكاوانە قسە دەكەن، ئەوی تریشیان شوكور مستەفا باس لەخەمی زمان و وەرگێڕان و بەرهەمەكانی خۆی و چەند تێبینی و سەرنجێكی ورد دەكات سەبارەت بە وەرگێڕان و پێگەی زمانی كوردی لەو بوارەدا.

* هەر لەم ژمارەیەدا وتارێكی (كاروان عوسمان خەیات)مان بڵاوكردووەتەوە، بەناونیشانی پێداچوونەوە و ڕاستكردنەوەی نادرنامەی ئەڵماس خانی كەڵهوڕ، وتارەكە بەهەناسەیەكی ڕەخنەگرانە لەسەر شوكور مستەفا نووسراوە، ئەمەش لەپێناو درووستكردنی زەمینەی ڕەخنە و ڕەخنە لەخۆگرتن و درووستكردنی كەشی بەدواداچوون و گفتوگۆ لەسەر بەرهەمی نووسەران و ئەدیبانی پێشەنگی كورد، د.عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ و حەمەی مەلا كەریم، وەك دوو هاوڕێی نزیكی شوكور مستەفا لە دوو گۆشە نیگای جیاوازەوە وتاریان لەسەر شوكور مستەفا بۆ ئەم ژمارەیەی ڕۆڤار نووسیووە.

*هیوادارین، ئەم ژمارەیە دەروازەیەك بێت بە ئاڕاستەی ئاوڕدانەوە لە نووسەر و وەرگێڕ و زمانناسێكی پڕ بەرهەمی نەتەوەكەمان، كە خزمەتێكی گەورەی بە فەرهەنگ و كولتووری كوردی كردووە، دیارە لەم جۆرە نووسەرانەشدا زۆرن كتێبخانەی كوردی قەرزاربارییانە و نەوەی نوێش وەك پێویست هەستی بەئەركی بەسەركردنەوەیان نەكردووە.بێگومان ئەم دیاردەیە-واتە ئاوڕنەدانەوە لە كولتوورو فەرهەنگی ڕابردوو-لەخەسڵەتە هەرە دزێوەكانی كۆمەڵگە ناشارستانی و دواكەوتووەكانە. هیوادارین بۆ ئایندە تێپەڕێنین و دەرگایەك لەسەر هەندێ لەو شكۆمەندییە بكەینەوە.

**بەڕێوەبەری نووسین**

# ژیان و بەرهەمەکانی
# مامۆستا شوکور مستەفا

**ئا: ئاکام محەمەد**



* لەساڵی (١٩٢٦) لە گوندی «مامشە/ مەحمەشاه» لەناوچەی قـەرە حەسەن لەدایکبووە، باوکی خەڵکی سلێمانی و دایکی خەڵکی (کۆسە و بامردە)یە.

* لە تەمەنی(٩) مانگاندا بابی باروبنەی بۆ بارەگای بینایی چاوان پێچاوەتەوە و شکور مستەفا بە هەتیوی لەگەڵ دایکی بە هەژاریدا ماوەتەوە.

* لە (١٩٣٢)دا هاتۆتە کەرکووک، لەوێندەر خراوەتە بەر خوێندن و قورئانی پیرۆزی لەخزمەت مەلا ئایشەخاندا خەتم کردووە.

* لەخزمەت مەلا محەمەدی تورکماندا، فێری زمانەکانی تورکی و فارسی و عەرەبی بووە.

٥* لە (١٩٤١)دا بووە فەقێ و لە خزمەت مامۆستا مەلا سەعدولای کوڕی مەلا محەمەد ئەمینی هەوایی زادەی خەڵکی دوشیوان تا جامیی خوێندووە، پاشان لە خزمەت مامۆستا مەلا سەید ئەحمەدی جەباری و مەلا عەبدوڵڵا بڵاوە و مەلا عەلی لەیلاندا تا نیوەی سیووتیی خوێندووە.

* لە (١٩٤٧)دا چووەتە بەغدا و لە مەدرەسەی (الهداية الاسلامية)ی خوێندووە.

* لە (١٩٤٩)دا لە کۆلیژی شەریعە قبووڵکراوە .

* لەساڵی ١٩٥٥ دا لەگەڵ مام جەلال سەفەری وارشۆیان کردووە و هاواریان بۆ کورد کردووە، سەفەرەکەشی بەبۆنەی فستیڤاڵی پێنجەمی لاوانی دنیاوە بووە.

*لە (١٩٥٥/١١/١٢)دا بووەتە مامۆستای زمانی عەرەبی لە ناوەندی (بەعقووبە)و دوو ساڵ لەوێ مامۆستا بووە.

*لــە (١٩٥٧/٩/٢)دا دوورخـراوەتـەوە بۆ عانە و ڕاوە، لەوێش (٩) مانگ مامۆستای زمانی عەرەبی بووە.

*لە مانگی (٣)ی (١٩٥٧)دا دوورخراوەتەوە بۆ حەبانیە.

*لە کۆتاییەکانی سـاڵـی (١٩٥٨)دا گـوێـزراوەتـەوە بۆ کەرکوک، دواتر هاتووەتە سلێمانی و لە ناوەندی سلێمانی تا (١٩٦٠) ماوەتەوە.



* هەر لەو ساڵەدا گوێزراوەتەوە بۆ قەڵادزێ و هەر لەو ساڵەدا ڕاگوێزراونەتەوە بۆ کەربەلا و لەوێ شەش ساڵ ماوەتەوە.

*لە ساڵی (١٩٦٦)دا ڕاگوێزراوەتەوە بەغداد و تا ساڵی (١٩٧٠) لە ناوەندی جمهورییە مامۆستای زمانی عەرەبی بووە.

لەساڵی (١٩٧٠-١٩٧١) گوێزراوەتەوە بۆ بەڕێوبەرایەتی خوێندنی کوردی، لەگەڵ (سامی عەبدولڕەحمان)دا خوێندنی کوردییان تا دوا پلەی ناوەندی جێبەجێ کردووە، و سەرلەبەری کتێبە دەرونییەکانیان لەگەڵ مامۆستا و ڕۆشنبیرانی پەروەردە و خوێندندا کردووە بە کوردی.

*لە (١٩٧٥)دا گوێزراوەتەوە بۆ کۆڕی زانیاری کورد، لە بەغدا.

*لە (١٩٧٧)دا کراوە بە (امین عام)ی کۆڕی زانیاری کورد و لەگەڵ مامۆستا مەسعود محەمەدی جەلی زادەدا تا (١٩٧٩) کاری کردووە.

*پاشان کۆڕی زانیاری کورد هەڵوەشێندراوەتەوە و شکور مستەفا)یان کردووە بە پسپۆڕی زمان لە کۆڕی زانیاری عێراق (دەستەی کورد).

*لە (١٩٩٦)دا خانەنشینیان کردووە.

*لە (١٩٨٨/٣/١٦)ەوە هاتۆتەوە کوردستان و تا ڕۆژی مردنەکەی لە (٢٠٠٣)سەرگەرمی کاری زمان و ڕۆشنبیریی کوردی بووە.

## بەرهەمەکانی

١-چیرۆک بۆ منداڵان/ ئەنگێل کرالچێف/ بولغارستان (١٩٦٧) لە تورکییەوە کراوە بە کوردی.

٢-دمدم/داستان/ عەرەبی شەمۆ/ لە کرمانجی باکوورەوە بۆ کرمانجی باشوور (١٩٧٥).

٣-شیعری شاعیری هاوچەرخ، عەبدوڵڵا گۆران/ لە ئازەرییەوە بۆ عەرەبی (١٩٧٦).



٤-ئەفسانەی چیای ئاگری/ یەشار کەمال، لە تورکیەوە بۆ کوردی (١٩٧٧).
٥- ئەفسانەی کوێر ئۆغڵی، یەشار کەمال، لە تورکیەوە بۆ کوردی (١٩٧٩).
٦-کاریتە. یەشار کەمال/ ڕۆمان/ لە تورکییەوە بۆ کوردی (١٩٧٩).
٧-زەوی ئاسن و ئاسمان مس/ یەشار کەمال، لە تورکییەوە بۆ کوردی (١٩٧٩)
٨-تەنەکە، یەشار کەمال/لە تورکییەوە بۆ کوردی (١٩٧٩).
٩-یاداشتەکانی مەئموون بەگی کوڕی بەگەبەگ/ لە تورکی عوسمانییەوە بۆ عەرەبی لەگەڵ (مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی)دا (١٩٧٩).
١٠-لەمەڕ ڕەنگ و ڕووی ڕۆشنبیری تورک، (١٩٧٩).
١١-بـڕێ تێکستی فۆلکلۆری بەشێوەی کرمانجی باکوور/ کراوە بە پیتی کوردی عێراق و قاموسچەی بۆ ڕۆناوە، (١٩٧٩).
١٢- سترانێد تاریقی یا کوردا/ ئۆردیخانێ جەلیل/ کراوە بە پیتی کوردی کوردستانی عێراق و قاموسچەی بۆ دانراوە، (١٩٧٩).
١٣-مێژووی ئـەردەڵان/ مەستوورەی کوردستانی/ لە فارسییەوە بۆ کوردی لەگەڵ (د.حەسەن جاف) (١٩٨٣).
١٤-نبوة العراق الغجری/ عبدالمجید لطفی/ کراوە بە کوردی (١٩٨٣).
١٥-چامە شیعرێکی زۆر درێژ/ عەبدولەتیف بەندەر ئۆغلوو، لە تورکییەوە بۆ کوردی (١٩٨٧).
١٦-مێژووی کورد لە سەدەی (١٦)هەمدا، شەرەفنامەی وەک سەرچاوەیەکی مێژووینەی نەتەوەیی کورد/ د. ش. م. ئیسکەندەر/ لە ئازەرییەوە بۆ کوردی (١٩٨٨).
١٧-خەج و سیامەند/ سیابەند سەمەدۆف/ لە پیتی ڕووسییەوە بۆ کوردی و فەرهەنگی بۆ کراوە.
١٨-قلعة دمدم/ جەلیلێ جەلیل/ لە کوردییەوە بۆ عەرەبی لەگەڵ لیتۆژینەوەیەکی د. عیزەدین مەستەفا ڕەسووڵ.
١٩-بەدرخانیو جزیرا بۆتان/ مالمسانژ/ لە تورکییەوە بۆ عەرەبی، (١٩٨٨).
٢٠-مەولوودنامەی مەلا عوسمان ئەفەندی/ زازایی/ فەرهەنگی بۆکراوە.
٢١-بیراتیێد مـن/ ئەحمەدی مـیـرزای، لە پیتی ڕووسییەوە بۆ کوردی.
٢٢-یاداشتەکانی بڕێ گەڕیدەی بیانی لە کوردستاندا/ عیسمەت شەریف وانلوو، لە تورکیەوە بۆ کوردی.
٢٣-ناسکوێژی/ بەلاغەت.
٢٤-یاداشتەکانی سورمە خانم/ لە تورکییەوە بۆ کوردی.
٢٥-داستانی شێخ بەدرەدین کوڕی قازی سیماونا/ نازم حیکمەت/ لە تورکییەوە بۆ کوردی.






## کتێبی ئامادە بۆ لەچاپدان

١-ئەحمەدی خانی.

٢-هەژاری موکریانی.

٣-دۆزی ئەنەدۆڵی ڕۆژهەڵات(کوردستانی تورکیا)، لە تورکییەوە بۆ عەرەبی/ ئیسماعیل بێشکچی.

٤- مەلا ئیدریسی بەدلیس/ محەمەد بیراقدار/ لە تورکییەوە بۆ کوردی.

٥-بەشی سێیەم لە سێینەکەی یەشار کەمال/ لە تورکییەوە بۆ کوردی (گیای نەمر).

٦-عەبدوڵڵا جەودەت (جۆن تورک) و بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد

لەناو ئەو کتێبانەی نووسیویەتی ئامادەن بۆ لە چاپدان، کە خۆی لە ژیاندا مابوو زۆربەیان چاپکران. دوای کۆچ کردنیشی ئەم کتێب و سیپارانە لە چاپ دراون:

١-ئەندێشە و هونەر لە پێشکەوتنی کۆمەڵایەتیدا-٢٠٠٣ بە هاوکاری سەرۆ قادر.

٢-گوێ ئاگردان یا ئەشقێکی ناکام (شانۆنامە) لە تورکییەوە ٢٠٠٦.

٣-چەند وتارێک سەبارەت بە ژیان و نووسیەکانی –پاش گێڕانی چلەی ماتەمینی کە لە هەولێر ساڵی ٢٠٠٣ لەچاپ دراوە.






# شوكور مستەفا بیبلیۆگرافیاو پێرستی لە ناوەرۆكی كتێبی كوردیدا ١٩٦٩-٢٠١٠



ئامادەكردن: بوار نوورەدین

## پێشەكی

زۆرێك لە خوێنەران ئاگادارن، چەند ساڵێكە كار لە پڕۆژەیەكدا دەكەین و بەهۆی چەند هۆكارێكەوە، نەتوانراوە هەموو وردەكارییەكانی پڕۆژەكە تەواو بكەین، لەگەڵ ئەمەشدا، توانراوە چەند بەرهەمێكی لێ بڵاوبكەینەوە، بەتایبەت لە ژمارەكانی ڕۆڤاردا، هەندێ بیبلیۆگرافیای تایبەتمان ئامادە كردووە، وەك: (ئەمین زەكی بەگ، مستەفا بەگی كوردی، سالم، د.عیزەددین مستەفا ڕەسوول)، هەروەها لە چلەی كۆچی دوایی شاعیری گەورە (شێركۆ بێكەس)دا، بیبلیۆگرافیایەك و لەو مەراسیمەش كە لە كۆتایی ٢٠١٣دا، لەلایەن (یەكێتیی نووسەرانی كورد- لقی سلێمانی) بۆ (م.عەلائەددین سەجادی) سازكرا، بیبلیۆگرافیایەكمان ئامادە كرد. لە یادی ئەمساڵی ڕاپەڕینی ساڵی ١٩٩١دا، بیبلیۆگرافیایەكی تایبەتمان ئامادەكرد، كە لە ڕۆژی (٣/١١)دا، وەك (پاشكۆ)ی ڕۆژنامەی (كوردستانی نوێ)، بەناوی (كتێبنامەی ڕاپەڕین)، بڵاوبووەوە. بەپێی توانای خۆمان، زۆرترین وردەكاریمان لەگەڵ ئەم پڕۆژەیەدا كردووە و زۆریش پێوەی ماندوو بووین، بێ هیچ گومان و چەند و چونێك، كەموكورتی هەیە، كە ئەمەش سرووشتێكی ئامادەكردنی بیبلیۆگرافیایە، بەتایبەت لە وڵاتێكی وەك كوردستان و لەپێناوی كتێبی كوردیدا.

ئەم پڕۆژەیە، جگە لە كتێب بە زمانی كوردی – لە سەرەتاوە تاكو ساڵی ٢٠١٠–، كتێبی نووسراوی بە هیچ زمانێكی دیكە



**شوکور مستەفا لەسەر گۆڕی محەممەد قازی**

لەخۆنەگرتووە، هەروەها، گۆڤار و ڕۆژنامەی نەگرتووەتەوە، تەنیا ئەوانەی گرتووەتەوە کە وەك (کتێب)، دووبارە چاپ کراونەتەوە، لە هەمان کاتدا، پڕۆژەکە تەنیا ئەو کتێبانەی کۆکردووەتەوە کە لەبارەی (کورد و کوردستان) نووسراون. لە بەرگی سێیەم (ئەدەبی کوردی)دا، چیرۆك و ڕۆمان و دیوانی هیچ شاعیرێکمان وەرنەگرتووە، بەڵام هەموو ئەو لێکۆڵینەوە و نووسین و بابەت و وتارانە... تاد، وەرگیراون، کە پەیوەندییان بە: شیعر، ژیان، سەردەم... شاعیرانی کوردەوە هەیە، چونکە کاتێك لێکۆڵینەوە لەبارەی شاعیر یان چیرۆکنووسێکی کورد دەکرێت، تا ڕادەیەك بەرهەمەکانیان دیارە، بەڵام ئەوەی، کە کارئاسانی بۆ لێکۆڵەران دەکات، ئەمەیە، کە ئایا چی و کێ و کەی و چۆن؟ لەبارەیەوە نووسراوە.

## ئەم بیبلیۆگرافیایە

بەپێی ئەو ژیاننامەیەی لە پاشکۆی کتێبی ژمارە ٢ی یەکەم بیبلیۆگرافیادا، نووسراوە، مامۆستا شوکور تا ساڵی ٢٠٠٦، تەنیا ٢٦ بەرهەمی چاپ بووە، هەرچەندە لێرەدا لەو ژمارەیەمان زۆرتر ساخ کردووەتەوە، لەگەڵ ئەمەشدا، سێ کتێبمان بۆ ساخ نەکرایەوە:

١- لە مەڕ ڕەنگ و ڕووی ڕۆشنبیری تورك، ١٩٧٩.

٢- مەولوودنامەی مەلا عوسمان ئەفەندی- زازایی، فەرهەنگی بۆ کراوە؟

٣- یادداشتەکانی سوورمە خانم، لە تورکییەوە بۆ کوردی؟

ئەم دوو بیبلیۆگرافیایەی لێرەدا ئامادە کراون، یەکەمیان سێ تەوەرە: ١- کتێبی نووسراو (٤ دانە). ٢- کتێبی وەرگێڕدراو (٤٤ دانە). ٣- پێداچوونەوە و بابەت و وتاری مامۆستا لە کتێبی دیکەدا (١٥ دانە). هەندێ لە بەرهەمەکانی مامۆستا، کاری هاوبەش بوون.

بیبلیۆگرافیای دووەم، دوو تەوەرە: ١- ئەو کتێبانەی بەشێوەیەکی سەربەخۆ لەبارەی ئەوەوە نووسراون (٢ دانە). ٢- ئەو چەند بابەت و وتار و چاوپێکەوتنانەی کە لەبارەی (مامۆستا)وە بڵاوکراونەتەوە (٦ دانە). لەکاتێکدا، تەنیا (ناوەڕۆك)ی ئەو چەند کتێبە هێڵدراوەتەوە، کە لە نووسینی خۆی بوون، واتە ناوەڕۆکی کتێبەکانی دیکە لابراون. هەروەها بەهۆی ئەوەی لە پڕۆژەی بیبلیۆگرافیا گشتییەکەدا، (ناوەڕۆك)ی هەموو کتێبەکان نووسراونەتەوە - هاوشێوەی بیبلیۆگرافیای یەکەم- لە پێناوی ئامادەکردنی ئەم بیبلیۆگرافیایەدا، تەنیا ناسنامەی کتێبەکان و ئەو ناونیشانانە هێڵدراونەتەوە، کە پەیوەندییان بە مامۆستاوە هەیە.

لە پێناوی ئامادەکردنی ئەم بیبلیۆگرافیایە و بەتایبەت (بەشی دووەم)ی بیبلیۆگرافیای یەکەمدا (کتێبە وەرگێڕدراوەکان) بەشوێن هەموو بەرهەمەکانیدا گەڕاوین، واتە سنوورێکی پڕۆژەکەمان تێپەڕاند و هەوڵی ئامادەکردنی هەموو ئەو

کتێبانەمان دا، کە بە هەر شێوەیەک بێت، مامۆستا شوکور کاری تێدا کردوون، هەروەها، هاوشێوەی پرۆژە گشتییەکە، ئەو کتێبانە تۆمار نەکراون کە تایبەت بوون بە (بەرنامەی خوێندن) و ئەو کاری تێدا کردوون.

لەم بیبلیۆگرافیایەدا، هەروەک تەواوی پرۆژەکە، کتێبەکان بەپێی ساڵ و لە هەر ساڵێکیشدا، بەپێی (تیپ)ە کوردییەکان ڕیز کراون. هەروەها بەپێچەوانەی بیبلیۆگرافیا سەرەکییەکە، ناونیشانی کتێبەکانیش بەپێی ڕێنووسی ئێستا نووسراونەتەوە.

لەپێناوی زانیاریی زۆرتر لەبارەی پرۆژەکە و شێوازی بیبلیۆگرافیاکە، خوێنەر دەتوانێ بگەڕێتەوە: بیبلیۆگرافیای کتێبی کوردی- بەرگی یەکەم: مێژوو و جوگرافیا، لە بڵاوکراوەکانی ئەکادیمیای کوردی، هەولێر، چ(حاجی هاشم)، ٢٠١٤.

## هێما بەکارهاتووەکان

چاپ: نۆرەی چاپ واتە چاپی یەکەم و دووەم

چ: چاپخانە

ش: شوێن

ژس: ژمارەی سپاردن

س: ساڵ

ل: لاپەڕە

ق: قەوارە (بە سانتیمەترە و «پانی»ی پێش «درێژی»ی نووسراوە)

؟: بۆ هەر زانیارییەکی نەزانراو و نادیار دانراوە

بۆ کورتکردنەوەی ناوی چاپخانەکان

ز: زانکۆ/ و- وەزارەت/ کۆڕ: چاپخانەی کۆڕی زانیاریی (عێراق و کورد)

**یەکەم بیبلیۆگرافیا**

**نووسین و وەرگێڕان و بابەت**

**یەکەم: نووسینی کتێب**

١. ئەندێشە و هونەر لە پێشکەوتنی کۆمەڵایەتیدا

نووسین: شوکور مستەفا بە هاوکاریی (سەرۆ قادر)

لەسەر ئەرکی بەڕێز نێچیرڤان بارزانی لە چاپ دراوە

چاپ: یەکەم، چ: ز- سەلاحەددین، ش: هەولێر، ژس: ٣٥٩، س: ٢٠٠٣، ل:٥٠٠، ق:١٦×٢٣

ناوەرۆک:

نێوەرۆک/ گوزارش و شاهیدییەک/ بەشی یەکەم: I مێژوو/ II کۆیلەتی/ بەشی دووەم: III زمان/ IV ئاگایی نەتەوەیی/ بەشی سێیەم: V ئایین، جادوو تەسەوف و عیرفان/ VI فەلسەفە/ بەشی چوارەم: VII وجودییەت/ VIII مۆدێرنیزم، مۆدێرنیتە و پۆست مۆدێرنیزم/ IX تەئویل/ X ئازادی/ XI هونەر/ نمایەی زاراوە و ناوەکان.

٢. سەرچاوەکانی بیروباوەڕی کوردەواری

نووسین: شوکور مستەفا

لە بڵاوکراوەکانی بەڕێوەبەرایەتی ڕۆشنبیری ڕامان

چاپ: یەکەم، چ: و- پەروەردە، ش: هەولێر، ژس: ٤٥٢، س: ٢٠٠٦، ل:٢٣٩، ق:١٥×٢١

ناوەرۆک:

بەر لە خوێندنەوەی ئەم کتێبە: ئازاد عەبدولواحید (لێرەدا نووسراوە: بیرۆکەی نووسینی ئەو لێکۆڵینەوەیە، بە پێشنیارێکی من دەستی پێکرد، کاتێ عەرزی مامۆستام کرد ئەو باشترین و لەبارترین کەسە بتوانێ سەبارەت بە بونیادی عەقڵی خورافی و ئەفسانەیی و ئایینی کۆمەڵی کوردەواری بنووسێ. هەروەها نووسراوە: ئەو کتێبەی ئێستا لەبەر دەستان دایە بریتییە لەو حەوت لێکۆڵینەوەیەی بەو ناونیشانەی کتێبەکەی پێوە ناونراوە، بە حەوت زنجیرەی پچڕپچڕ لە گۆڤاری «ڕامان»دا بڵاوکرایەوە)/ ژیان و بەرهەمەکانی مامۆستا شوکور مستەفا- بە دەستخەتی خۆی.

٣. جوانیی زمانی کوردی- چەند وردە بابەتێک

نووسین: شوکور مستەفا

لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس

چاپ: یەکەم، چ: ئاراس، ش: هەولێر، ژس: ٦٠٣، س: ٢٠١٠، ل:١٤٧، ق:١٢×١٩

ناوەرۆک:

پێڕست/ بەباڵا بڕینێ... لەبارەی مامۆستا شوکور مستەفاوە: محەمەدی مەلا کەریم/ جوانی/ جوانیی زمانی کوردی/ شوکور مستەفا لەبارەی وەرگێڕانەوە دەدوێ/ بێ دڵ/ پەیمانی دیاربەکر ١٩٠٩/ کوردی زادە ئەحمەد ڕامیزی لیجی/ عەلی عەبدورەحمان شاعیر و نووسەری کوردی ئەرمەنستانی سۆڤیەت/ داستانی کەڕ و کولک/ مامک مەتەڵ/ گۆرانیی کوردیی زازیی.



٤. ناسكوێژی

نووسین: شوكور مستەفا

لە بڵاوكراوەكانی دەزگای چاپ و بڵاوكردنەوەی ئاراس

چاپ: یەكەم، چ: ئاراس، ش: هەولێر، ژس: ٢٧٢، س: ٢٠١٠، ل:٨٠، ق:١٢×١٩

ناوەرۆك:

ئەحمەد عارف شاعیری گەورەی كورد لە كوردستانی توركیا/ ڕەنگ و ڕووی نوێی مرۆ لە هونەر و بەهرەی (یەشار كەمال)دا لەبارەی ڕۆمانی (تەنەكە)وە/ ناسكوێژی/ چەرخی نووسەرانی بوێر و ئازا- یەشار كەمال/ ناوەرۆك.




## دووەم: وەرگێران و گۆڕینی تیپ

١. دنیای چیرۆك بۆ منداڵان

نووسین: ئەنگێل كرالچێف بولگاری، وەرگێڕانی لە زمانی توركییەوە: شوكور مستەفا، چاپ: یەكەم، چ: سلمان الاعظمی، ش: بەغدا، ژس: ؟، س: ١٩٦٩، ل:٨٨، ق:١٤×٢١

تێبینی:

- بەداخەوە ئەم كتێبەمان نەكەوتە بەردەست، لەبەر ئەوە هەندێ زانیاری ناتەواوە، هەندێ زانیاریشی بەپێی (ببلیۆگرافیای كتێبی كوردی ١٧٨٧- ١٩٧٥، ئا: «نەریمان» مستەفا سەید ئەحمەد، لە چاپكراوەكانی كۆڕی زانیاری كورد، چ «كۆڕ»، بەغدا، ١٩٧٧، ل١٧٢) وەرگیراوە.
- لەو بابەتەی كە لە پاشكۆی كتێبی ژمارە ٢ی یەكەم بیبلیۆگرافیادا (ژیان و بەرهەمەكانی مامۆستا شوكور مستەفا- بە دەستخەتی خۆی) دانراوە، ساڵی ئەم كتێبە ١٩٦٧ نووسراوە؟




٢. ئازار هی من ئاوات هی تۆ باهۆز هی هەموومان

نووسین: عەبدوللەتیف بەندەر ئۆغلوو، وەرگێڕانی لە زمانی توركییەوە: شوكور مستەفا، لە بڵاوكراوەكانی ، چاپ: یەكەم، چ: ؟، ش: ؟، ژس: ؟، س: ١٩٨٧، ل:؟، ق:؟×؟

تێبینی: بەداخەوە چاپی یەكەمی ئەم كتێبەمان نەكەوتە بەردەست، لەبەر ئەوە هەندێ زانیاری ناتەواوە، ساڵی چاپەكەشی بەپێی پاشكۆی كتێبی ژمارە ٢ی یەكەم بیبلیۆگرافیا، دانراوە.

٣. کلامێد جمعەتا کوردایە لیریکی یێ

ئامادەکردن: پ.حاجی جندی، گۆڕینی لە تیپی لاتینییەوە: شوکور مستەفا، لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاریی کورد، چاپ: یەکەم، چ: کۆڕ، ش: بەغدا، ژس: !، س: ١٩٧٤، ل:٦٦٤–٧٥٠، ق:١٧×٢٤

تێبینی: ئەم کتێبە لە بەشی یەکەمی بەرگی دووەمی گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، وەرگیراوە.

٤. دمدم – داستان

نووسین: عـەرەب شامیلۆڤ (عـەرەب شەمۆ)، وەرگـێڕان: شوکور مستەفا، لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاریی کورد، چاپ: یەکەم، چ: کۆڕ، ش: بەغدا، ژس: ٨٥٦، س: ١٩٧٥، ل:٣٦٧، ق:١٧×٢٤

٥. ئەفسانەی چیای ئاگری

نووسین: یەشار کەمال، وەرگێڕانی لە زمانی تورکییەوە: شوکور مستەفا، لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاریی کورد، چاپ: یەکەم، چ: کۆڕ، ش: بەغدا، ژس: ٣٠٩، س: ١٩٧٦، ل:١٧٨، ق:١٧×٢٤

٦. کۆمەڵە تێکستی فۆلکلۆری کوردی لە زاری کوردەکانی سۆڤێتەوە تۆمارکراوە

کۆکردنەوە و ئامادەکردن: پ.قەناتی کوردۆ (کوردۆییڤ)، هێنانەسەر ڕێنووسی کوردی و ساغکردنەوە و لێکدانەوە: شوکور مستەفا و ئەنوەر قـادر محەممەد، پێشەکی و پێداچوونەوە: د.ئەوڕەحمانی حاجی مارف، لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاریی کورد، چاپ: یەکەم، چ: کۆڕی زانیاری کورد، ش: بەغدا، ژس: ٧٥، س: ١٩٧٦، ل:٢٧٣، ق:١٧×٢٤

٧. سترانێ زارگۆتنا کوردایە تاریقیێ

کۆکردنەوە و ئامادەکردن: ئۆردیخانی جەلیل، هێنانەسەر ڕێنووسی کـوردی و ساغکردنەوە و لێکدانەوە: شوکور مستەفا و ئەنوەر قادر محەممەد، لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد– زنجیرەی ژیاندنەوەی کەلەپووری ئەدەبیی کورد، چاپ: یەکەم، چ: کۆڕی زانیاری کورد، ش: بەغدا، ژس: ١٣٩٩، س: ١٩٧٨، ل:٥١٧، ق:١٧×٢٤

٨. ئەفسانەی کوێر ئۆغلی

نووسین: یەشار کەمال، وەرگێڕانی لە زمانی تورکییەوە: شوکور مستەفا، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی، چاپ: یەکەم، چ: کۆڕ، ش: بەغدا، ژس: ١٧٩٩، س: ١٩٧٩، ل:١٩١، ق:١٤×٢٠

٩. سیابەند و خەجێ

کۆکردنەوە: سیابەندۆڤ سەمەند، گۆڕینی لە ڕێنووسی سلاڤییەوە بۆ سەر ڕێنووسی کوردی و فەرهەنگۆک: شوکور مستەفا، لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری عێراق– دەستەی کورد، چاپ: یەکەم، چ: کۆڕ، ش: بەغدا، ژس: ٦١٢، س: ١٩٨٠، ل:١٩١، ق:١٥×٢٢

١٠. داستانی شێخ بەدرەدین کوڕی قازیی سیماویە

نووسین: نازم حیکەت، وەرگێڕانی لە زمانی تورکییەوە: شوکور مستەفا، چاپ: یەکەم، چ: الحوادث، ش: بەغداد، ژس: ٥٨٤، س: ١٩٨١، ل:٧٨، ق:١٥×٢١

١١. تەنەکە

نووسین: یەشار کەمال، وەرگێڕانی لە زمانی تورکییەوە:






شوکور مستەفا، چاپ: یەکەم، چ: الّدیب، ش: بەغداد، ژس: ٥٣١، س: ١٩٨١، ل:٢٠٦، ق:١٢×١٦

١٢. کورد و کوردستان لە نیگای چەند گەڕیدەیەکی ڕۆژئاواییەوە– لە بەرگی هەشتەمی گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق– دەستەی کورد دەرهێنراوە

نووسین: چەند گەڕیدەیەکی خۆرئاوایی، وەرگێڕانی لە زمانی تورکییەوە: شوکور مستەفا، لە بڵاوکراوەکانی کۆڕی زانیاری عـێراق، چاپ: یەکەم، چ: کۆڕ، ش: بەغداد، ژس: ؟، س: ١٩٨١، ل:١٢١–١٥٨، ق:١٢×١٧

١٣. کاریتە یا ئەودیوی چیا

نووسین: یەشار کەمال، وەرگێڕانی لە زمانی تورکییەوە: شوکور مستەفا، بە یارمەتی ئەمینداریێتیی گشتیی ڕۆشنبیری و لاوانی ناوچەی ئۆتۆنۆمی چاپ کراوە، چاپ: یەکەم، چ: علاو، ش:، ژس: ١١١٨، س: ١٩٨٣، ل:٤٣٢، ق:١٧×٢٤

١٤. دمدم– داستان

نووسەر: عەرەب شامیلۆڤ (عەرەب شەمۆ)، وەرگێڕانی: شوکور مستەفا، چاپ: دووەم، چ: کۆڕ، ش: بەغدا، ژس: ٧٩٩، س: ١٩٨٤، ل:٣١٦، ق:١٧×٢٤

١٥. ئەودیوی چیا ٢– زەوی ئاسن و ئاسمان مس




نووسین: یەشار کەمال، وەرگێڕانی لە زمانی تورکییەوە: شوکور مستەفا، بە یارمەتی ئەمینداریێتیی گشتیی ڕۆشنبیری و لاوان چاپ کراوە، چاپ: یەکەم، چ: علاو، ش: بەغدا، ژس: ٧٦٨، س: ١٩٨٧، ل:٤٢٤، ق:١٧×٢٤

١٦. پێشبینیی لێزانە قەرەجەکە

نـووسـین: عەبدولمەجید لوتفی، وەرگـێڕانـی لـە زمانی عەرەبییەوە: شوکور مستەفا، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کـوردی، چاپ: یەکەم، چ: دار الحریە، ش: بەغدا، ژس: ١٠٤٠، س: ١٩٨٨، ل:١٨٤، ق:١٤×٢١

١٧. مێژووی ئـەردەڵان– ماه شەرەفخانم (مەستوورە)ی کوردستان

نـووسـین: مـەسـتـوورەی کوردستانی (مـاه شەرەفخانم)، وەرگێڕانی لە زمانی فارسییەوە: د.حەسەن جاف و شوکور مستەفا، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کـوردی، چاپ: یەکەم، چ: دار الحریە، ش:، ژس: ؟، س: ١٩٨٩، ل:٢٨٠، ق:١٣×٢٢

١٨. زارگوتنا کوردا– ١

کۆکردنەوە و ئامادەکردن: ئۆردیخانێ جەلیل و جەلیلێ جەلیل ، گۆڕینی لە تیپی لاتینییەوە و فەرهەنگۆك: شوکور مستەفا و عەبدوللەتیف عەبدولمەجید گلی، لە بڵاوکراوەکانی کۆڕی زانیاری عـێراق– دەستەی کورد، چاپ: یەکەم، چ:!، ش: بەغدا، ژس: ٤٧٦، س: ١٩٩١، ل:٥٩٦، ق:١٧×٢٤

١٩. مێژووی کـورد لە سـەدەی ١٦هـەمدا– شەرەفنامەی شەرەفخانی بەدلیسی وەك سەرچاوەیەکی مێژووی نەتەوەی کورد

نووسین: د.شەمسی محەممەد ئیسکەندەر، وەرگێڕانی لە زمانی ئازەربایجانییەوە: شوکور مستەفا

چاپ: یەکەم، چ: و– ڕۆشنبیری، ش: هەولێر، ژس: ٧٢، س: ١٩٩٨، ل:١٧٦، ق:١٦×٢٣

٢٠. ئیدریسی بدلیسی

نووسین: محەممەد بایراقدار، وەرگێڕانی لە زمانی تورکییەوە: شوکور مستەفا، لە بڵاوکراوەکانی سەنتەری برایەتی، چاپ: یەکەم، چ: و–پـەروەردە، ش: هەولێر، ژس: ؟، س: ١٩٩٩، ل:١١٩، ق:١٥×٢٢






٢١. کۆمەڵناسیی گەلی کورد- ئاغا، شێخ و دەوڵەت- بنیاتەکانی کۆمەڵەکی و سیاسی کوردستان

نووسین: مارتن ڤان بروویین سن، وەرگێڕانی بۆ زمانی فارسی: ئیبراهیمی یوونسی، وەرگێڕانی لە فارسییەوە: شوکور مستەفا، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، چاپ: یەکەم، چ: و-پەروەدە، ش: هەولێر، ژس: ٨٥، س: ٢٠٠٠، ل:٤٨، ق:١٥×٢٨: لەجیاتی پێش وتار: شوکور مستەفا.

٢٢. بیرەوەریی عەبدولڕەزاق بەدرخان

نووسین: عەبدولڕەزاق بەدرخان، وەرگێڕان لە ؟ و ئامادەکردن: جەلیلی جەلیل، وەرگێڕانی لە ؟: شوکور مستەفا، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، چاپ: یەکەم، چ: و- پەروەردە، ش: هەولێر، ژس: ٨١، س: ٢٠٠٠، ل:٩٥، ق:١٥×٢١

٢٣. خۆییبوون و شۆڕشی ئاگری

نووسین: ڕۆهات ئالاکۆم، وەرگێڕانی لە زمانی تورکییەوە: شوکور مستەفا، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، چاپ: یەکەم، چ: و- پەروەردە، ش: هەولێر، ژس: ٨٢، س: ٢٠٠٠، ل:١٧٦، ق:١٥×٢١

٢٤. دیوانی شێخ ڕەزای تاڵەبانی

نووسین: شێخ ڕەزای تاڵەبانی، ساغکردنەوە و شەرحکردن: شوکور مستەفا، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، چاپ: یەکەم، چ: و-پەروەردە، ش: هەولێر، ژس: ٨٣، س: ٢٠٠٠، ل:٥٧٥، ق:١٧×٢٣

٢٥. نادرنامەی ئەڵماس خانی کەڵهوڕ

نووسین: ئەڵماس خانی کەڵهوڕ، بە ڕێنووسی باوی ئەمڕۆ نووسینەوە و فەرهەنگۆك بۆ دانانی: شوکور مستەفا، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، چاپ: یەکەم، چ: و-پەروەردە، ش: هەولێر، ژس: ١٦٠، س: ٢٠٠٠، ل:٣٩١، ق:١٦×٢٣

٢٦. یاداشتەکانی مەئموون بەگ کوڕی بێگە بەگ فەرمانڕەوای شارەزوور- ڕووداو و بەسەرهاتەکانی ناوچەی شارەزوور پێنجسەد ساڵ بەر لە ئەمڕۆ

نووسین: مەئموون بەگ کوڕی بێگە بەگ، وەرگێڕانی لە زمانی تورکییەوە بۆ زمانی عەرەبی: محەممەد جەمیل ڕۆژبەیانی و شوکور مستەفا، وەرگێڕانی لە زمانی عەرەبییەوە: سەلاح نەقشبەندی، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، چاپ: یەکەم، چ: سەردەم، ش: سلێمانی، ژس: ٢٧١، س: ٢٠٠١، ل:١١٣، ق:١٤×٢٠

٢٧. مێژووی ئەردەڵان

نووسین: مەستوورەی کوردستانی (ماه شەرەفخانم)، وەرگێڕانی لە زمانی فارسییەوە: د.حەسەن جاف و شوکور مستەفا، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس (لە زنجیرە کتێبە بڵاوکراوەکانی بیرئانینی مەستوورەی ئەردەڵان)، چاپ: دووەم، چ: و- پەروەردە، ش: هەولێر، ژس: ٧٣٠، س: ٢٠٠٥، ل:١٧٦، ق:١٥×٢١

٢٨. گوێ ئاگردان یا ئەشقێکی ناکام

نووسین: نازم حیکمەت، وەرگێڕانی لە زمانی تورکییەوە:

شوکور مستەفا، لە بڵاوکراوەکانی بەڕێوەبەرایەتی ڕۆشنبیریی ڕامان، چاپ: یەکەم، چ: و- پەروەردە، ش: هەولێر، ژس: ١٤٧، س: ٢٠٠٦، ل:٤٧، ق:١٥×٢١

٢٩. دیوانی قاصد (حاجی بەکرئاغا حەوێزی) (١٢٠٠-١٢٧٠ك.م/ ١٧٨٥- ١٨٥٣ن)

نووسین: حاجی بەکرئاغا حەوێزی، ساغکردنەوە: شوکور مستەفا و ڕەحیم سوورخی، لە بڵاوکراوەکانی ئەکادیمیای کوردی، چاپ: یەکەم، چ: خانی، ش: دهۆك، ژس: ١٨١٩، س: ٢٠٠٨، ل:٣٥٢، ق:١٦×٢٢

٣٠. ئیدریسی بدلیسی

نووسین: محەمەد بایراقدار، وەرگێرانی لە زمانی تورکییەوە: شوکور مستەفا، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، چاپ: دووەم، چ: ئاراس، ش: هەولێر، ژس: ٢٥٧٤، س: ٢٠٠٩، ل:١٣٦، ق:١٢×١٩

٣١. مێژووی کورد لە سەدەی ١٦هەمدا- (شەرەفنامە)ی شەرەفخانی بدلیسی وەك سەرچاوەیەکی مێژووی نەتەوەی کورد

نووسین: د.شەمسی محەممەد ئیسکندەر، وەرگێرانی لە زمانی ئازەرییەوە: شوکور مستەفا، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، چاپ: دووەم، چ: ئاراس، ش: هەولێر، ژس: ٢٥٠٦، س: ٢٠٠٩، ل:٢٤٧، ق:١٢×١٩

٣٢. ئازار هی من ئاوات هی تۆ باهۆز هی هەمووما

نووسین: عەبدوللەتیف بەندەر ئۆغلوو، وەرگێرانی لە زمانی تورکمانییەوە: شوکور مستەفا، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، چاپ: دووەم، چ: ئاراس، ش: هەولێر، ژس: ١٨١، س: ٢٠١٠، ل:٧٠، ق:١٣×١٩

٣٣. ئەفسانەی چیای ئاگری

نووسین: یەشار کەمال، وەرگێرانی لە زمانی تورکییەوە: شوکور مستەفا، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، چاپ: دووەم، چ: ئاراس، ش: هەولێر، ژس: ١٧٥، س: ٢٠١٠، ل:١٦٠، ق:١٣×١٩

٣٤. ئەفسانەی کوێر ئۆغلی

نووسین: یەشار کەمال، وەرگێرانی لە زمانی تورکییەوە: شوکور مستەفا، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، چاپ: دووەم، چ: ئاراس، ش: هەولێر، ژس: ١٧٦، س: ٢٠١٠، ل:١٣٠، ق:١٣×١٩

٣٥. بیرانینێد من

نووسین: ئەحمەدێ میرازی، وەرگێرانی لە تیپی سلاڤی و پەراوێز بۆ نووسین: شوکور مستەفا، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، چاپ: دووەم، چ: ئاراس، ش: هەولێر، ژس: ٧٨٢، س: ٢٠١٠، ل:١٥٠، ق:١٣×١٩: پێشەکییەکی بێ ناونیشان: وەرگێر (شوکور مستەفا).

٣٦. پێشبینیی لێزانە قەرەجەکە

نووسین: عەبدولمەجید لوتفی، وەرگێرانی لە زمانی عەرەبییەوە: شوکور مستەفا، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، چاپ: دووەم، چ: ئاراس، ش: هەولێر، ژس: ١٧٨، س: ٢٠١٠، ل:١٣٤، ق:١٣×١٩



٣٧. تەنەکە
نووسین: یەشار کەمال، وەرگێڕانی لە زمانی تورکییەوە: شوکور مستەفا، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، چاپ: دووەم، چ: ئاراس، ش: هەولێر، ژس: ١٧٧، س: ٢٠١٠، ل:١١١، ق:١٣×١٩

٣٨. داستانی شێخ بەدرەدین کوڕی قازیی سیماویە
نووسین: نازم حیکمەت، وەرگێڕانی لە زمانی تورکییەوە: شوکور مستەفا، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، چاپ: دووەم، چ: ئاراس، ش: هەولێر، ژس: ٢١٧، س: ٢٠١٠، ل:٧٦، ق:١٣×١٩

٣٩. دمدم – داستان
نووسین: عەرەب شامیلۆڤ (عەرەب شەمۆ)، وەرگێڕان: شوکور مستەفا، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، چاپ: دووەم، چ: ئاراس، ش: هەولێر، ژس: ١٧٤، س: ٢٠١٠، ل:٢٨٥، ق:١٣×١٩

٤٠. دیوانی شێخ ڕەزای تاڵەبانی
نووسین: شێخ ڕەزای تاڵەبانی، ساغکردنەوە و شەرحکردن: شوکور مستەفا، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، چاپ: دووەم، چ: ئاراس، ش: هەولێر، ژس: ٦٠٤، س: ٢٠١٠، ل:٥٧٩، ق:١٣×١٩

٤١. کاریتە یا ئەودیوی چیا– بەشی یەکەم
نووسین: یەشار کەمال، وەرگێڕانی لە زمانی تورکییەوە: شوکور مستەفا، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، چاپ: دووەم، چ: ئاراس، ش: هەولێر، ش:، ژس: ١٧٩، س: ٢٠١٠، ل:٥٠٤، ق:١٣×١٩

٤٢. ئەودیوی چیا– زەوی ئاسن و ئاسمان مس/ بەشی دووەم
نووسین: یەشار کەمال، وەرگێڕانی لە زمانی تورکییەوە: شوکور مستەفا، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، چاپ: دووەم، چ: ئاراس، ش: هەولێر، ش:، ژس: ١٨٠، س: ٢٠١٠، ل:٥١٠، ق:١٣×١٩

٤٣. کورد و کوردستان لە نیگای چەند گەڕیدەیەکی ڕۆژئاواییەوە
نووسین: چەند گەڕیدەیەکی خۆرئاوایی، وەرگێڕانی لە زمانی تورکییەوە: شوکور مستەفا، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ











و بڵاوکردنەوەی ئاراس، چاپ: یەکەم، چ: ئاراس، ش: هەولێر، ژس: ٦٠٢، س: ٢٠١٠، ل:٦٣، ق:١٣×١٩

تێبینی: هەرچەند نووسراوە (یەکەم) بەڵام چاپی دووەمە، بڕوانە کتێبی ژمارە ٥٤.

٤٤. سیابەند و خەجێ

کۆکردنەوە: سیابەندۆڤ سەمەند، گۆڕینی بۆ ڕێنووسی کوردیی خواروو: شوکور مستەفا، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، چاپ: یەکەم، چ: ئاراس، ش: هەولێر، ژس: ٧٤٢، س: ٢٠١٠، ل:١٥٨، ق:١٢×١٩

## سێیەم: پێداچوونەوە و نووسینی بابەت و وتار

١. یادی قانع– بیروڕای کۆمەڵێك ڕۆشنبیری کوردە بەرامبەر بە شاعیر و هەڵوێست و شیعرەکانی

کۆکردنەوە و چاپکردن: بورهان قانع، بە یارمەتی ئەمینداریێتی گشتیی ڕۆشنبیری و لاوانی ناوچەی ئۆتۆنۆمی چاپ کراوە، چاپ: یەکەم، چ: ئیرشاد، ش: بەغدا، ژس: ١٦١٨، س: ١٩٧٨، ل:١٠٤، ق:١٧×٢٤: وتاری مامۆستا شوکور مستەفا.

٢. لە یادی گیوی موکریانی دا

ئامادەکردن: کەریم شارەزا، لە بڵاوکراوەکانی (یەکێتیی نووسەرانی کورد لقی هەولێر) و (کۆمەڵی هونەر و وێژەی کوردی– لقی هەولێر)، چاپ: یەکەم، چ: کوردستان، ش: هەولێر، ژس: ١٧٨، س: ١٩٧٨، ل:٧٢، ق:١٧×٢٤: وتاری کۆڕی زانیاری کورد: شوکور مستەفا.

٣. پیرەمێرد و زەریا

نووسین: ئێرنست هێمنگوای، وەرگێڕانی لە زمانی عەرەبییەوە: شێرکۆ بێکەس، پێداچوونەوە: شوکور مستەفا، لەبڵاوکراوەکانی وەزارەتی ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندن– دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی، چاپ: یەکەم، چ: المؤسسە العراقیە للدعایە والگباعە، ش: بەغدا، ژس: ١٥٠٩، س: ١٩٨٢، ل:١٣٦، ق:١٧×٢٤

٤. شەهیدانی قەڵای دمدم

نووسین: مستەفا سالح کەریم، لە بڵاوکراوەکانی کتێبخانەی سلێمانی، چاپ: یەکەم، چ: عەلاو، ش: بەغدا، ژس: ١٦٤٢، س: ١٩٨٢، ل:٥٦، ق:١٢×١٧: پێشەکی: شوکور مستەفا.

٥. دیوانی کەمالی– عەلی باپیر ئاغا.

ئامادەکردن و ساغکردنەوە: کەمال عەلی باپیر، پێداچوونەوە: شوکور مستەفا، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی، چاپ: یەکەم، چ: دار شؤون الپقافیە العامە، ش: بەغدا، ژس: ٤١٤، س: ١٩٨٦، ل:٢٠٦، ق:١٧×٢٢.

٦. سەربردەی ژیانی سیاسیم– بەرگی یەکەم

نووسین: مەلا عەبدوڵڵای حاجی سمایل، بە یارمەتی ئەمینداریێتی گشتیی ڕۆشنبیری و لاوان چاپ کراوە، چاپ: یەکەم، چ: ڕەشاد، ش: بەغدا، ژس: ٦٦٥، س: ١٩٩٠، ل:٢٦٩، ق:١٦×٢٣: لەسەر بەرگی دواوە، کورتە نووسینێکی (مەلا شوکور– شوکور مستەفا) دانراوە.

٧. بارزانی

نووسین: هەژار موکریانی، چاپ: یەکەم، چ: و– ڕۆشنبیری، ش: هەولێر، ژس: ٢٤١، س: ١٩٩٨، ل:٦٤، ق:١٥×٢٠: پێشەکی: شوکور مستەفا.

٨. بۆ کوردستان

نووسین: هەژار، سەرپەرشتیاری چاپ: شوکور مستەفا و بەدران ئەحمەد، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی






ئاراس، چاپ: چوارەم، چ: و– پەروەردە، ش: هەولێر، ژس: ٧٨، س: ٢٠٠٠، ل:٦٢١، ق:١٧×٢٣: وشەیەکی پێویست: ئامادەکاران .

٩. چوار دەوڵەتی کورد– چوار دەوڵەتی فەرامۆشکراوی نەناسراو دونبولی، شاهێنی، شوانکارە، مینەتشاهی
نووسین: محەممەد جەمیل ڕۆژبەیانی، لە بڵاوکراوەکانی وەزارەتی ڕۆشنبیری، چاپ: یەکەم، چ: و– ڕۆشنبیری، ش: هەولێر، ژس: ١٠٣، س: ٢٠٠٠، ل:١٥١، ق:١٦×٢٢: پاشکۆ: شوکور مستەفا.

١٠. فەرهەنگ و لێکحاڵیبوون
ئامادەکردن: سەرۆ قادر، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریانی، چاپ: یەکەم، چ: و– پەروەردە، ش: هەولێر، ژس: ٢، س: ٢٠٠١، ل:٢٢٤، ق:١٧×٢٣: سنورێك لە نێوان ئازادی و بەرەڵایدا هەیە: شوکور مستەفا.

١١. مەحوی– بەشێك لە بابەتەکانی فێستیڤاڵی مەحوی
لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، چاپ: یەکەم، چ: و–پەروەردە، ش: هەولێر، ژس:٣٨٥، س: ٢٠٠١، ل:١٧٦، ق:١٧×٢٣: کێش و سەروایەکانی شیعری مەحوی: شوکور مستەفا.

١٢. پیرەمێرد و زەریا
نووسین: ئێرنست هێمنگوای، وەرگێرانی لە زمانی عەرەبییەوە: شێرکۆ بێکەس، پێداچوونەوەی: شوکور مستەفا، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، چاپ: دووەم، چ: سەردەم، ش: سلێمانی، ژس: ؟، س: ٢٠٠٢، ل:١٥٣، ق:١٤×٢٠

١٣. پێرەوانی ڕاستی– یارانی کوردستان (ئەهلی حەق)
نووسین: ن. ئیڤانۆڤا (هۆڵەندا– ١٩٥٣)، وەرگێرانی لە زمانی ئینگلیزییەوە: ئاسۆ کەریم، پێداچوونەوە: شوکور مستەفا، لە بڵاوکراوەکانی وەزارەتی ڕۆشنبیری– بەڕێوەبەرایەتی گشتی ڕۆشنبیری و هونەر، چاپ: یەکەم، چ: و–ڕۆشنبیری، ش: هەولێر، ژس: ٢٤٣، س: ٢٠٠٣، ل:٢٢٤، ق:١٦×٢٢.

١٤. فێستیڤاڵی هەژاری موکریانی
ئامادەکردن: شەماڵ حەویزی و کەریم سۆفی، لە بڵاوکراوەکانی بەڕێوەبەرایەتی گشتی ڕۆشنبیری و هونەر، چاپ: یەکەم، چ: و–ڕۆشنبیری، ش: هەولێر، ژس: ٦١٧، س: ٢٠٠٥، ل:٢٨٨، ق:١٦×٢٢: بابەتێك: شوکور مستەفا.

١٥. ڕۆژنامەوانیی کوردی– کۆواری دەفتەری کوردەواری ١٩٧٠
ئامادەکردنی: هیمداد حسێن، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، چاپ: یەکەم، چ: ئاراس، ش: هەولێر، ژس: ٢٣٠١، س: ٢٠١٠، ل:٥٠٣، ق:١٦×٢٣: بەرگی دووەم مارت– نیسانی ١٩٧٠– هەندێ بابەتی وەك: نەورۆز لە ئەدەبی گەلاندا: شوکور مستەفا.

شوکور مستەفا



## دووەم بیبلیۆگرافیا
## کتێب و بابەت و چاوپێکەوتن

### یەکەم: کتێبی سەربەخۆ

١. شوکورمستەفا.. گەشتێک بەناو زمان و فیکر و ئیستێتیکادا
هەڤپەیڤین: ئازاد عەبدولواحید– مەحموود زامدار
لە بڵاوکراوەکانی کتێبی گوڵان
چاپ: یەکەم، چ: ؟، ش: هەولێر، ژس: ١٧٦، س: ١٩٩٨، ل:١٣٥، ق:١٥×٢٠
ناوەرۆک:
چاوپێکەوتن لەگەڵ شوکور مستەفا/ لەگەڵ بوونی چەند وێنەیەکی جۆراوجۆری شاعیر و کەسایەتییە ناودارەکانی کورد/ ژیان و بەرهەمەکانی مامۆستا شوکور مستەفا.

٢. یادی ڕێزلێنانی شوکور مستەفا
ئامادەکردن و بڵاوکردنەوە: بنکەی کاوەی ڕۆشنبیری
چاپ: یەکەم، چ: حاجی هاشم، ش: هەولێر، ژس: ١٢٧، س: ٢٠٠٤، ل:١٠١، ق:١٦×٢٢
ناوەرۆک:
ڕۆژی ڕێزلێنانی کۆچکردوو مامۆستا شوکور مستەفا/ دەقی وتاری بنکەی کاوەی ڕۆشنبیری/ کۆمەڵێک وتار و برووسکە...

### دووەم: بابەت و چاوپێکەوتن

١. جنێوبژێرێک لە چێشتی مجێوری هەژار موکریانی دا
نووسین: باوکی سیناهی، چاپ: یەکەم، چ: ژیار، ش: سلێمانی، ژس: ٣٥٠، س: ١٩٩٩، ل:٥٣، ق:١٥×٢٠: هەندێ گێرانەوە و بەسەرهات کە یەکێکیان بە ناونیشانی (مەلا شوکور مستەفا) وە نووسراوە.

٢. دیداری ڕۆشنبیری– بەرگی یەکەم
نووسین: ئازاد هیدایەت دەلۆ، چاپ: یەکەم ، چ: ؟، ش: یەکەم ، ژس: ١٧٥، س: ٢٠٠٥، ل:٣٧٦، ق:١٥×٢٠: کۆمەڵێک دیدار و چاوپێکەوتن، کە لە (ڕادیۆی کوردی بەغدا) لە ساڵی ١٩٩٧ـەوە لە بەرنامەی (دیداری ڕۆشنبیری) پێشکەش کراون و یەکێکیان لەگەڵ (شوکور مستەفا)دا بووە.

٣. زناک– چەند بابەتێکی ڕووناکبیری
نووسین: محەممەد ڕەنجاو، لە بڵاوکراوەکانی بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی ڕۆشنبیری و هونەر، چاپ: یەکەم، چ: و–ڕۆشنبیری، ش: هەولێر، ژس: ٨، س: ٢٠٠٦، ل:١٢٥، ق:١٦×٢٢: شوکور مستەفا.

٤. یادی ئازیزان
نووسین: پ.شوکرییە ڕەسووڵ، چاپ: یەکەم، چ: کشتوکاڵ، ش: هەولێر، ژس: ٤٠، س: ٢٠٠٩، ل:١٤٨، ق:١٦×٢٣: خوێندنەوەی مێشکی ئینسکلۆپیدیای (شوکور مستەفا).

٥. کە بازنە و لاکێشەکان هەڵدەوەشێنەوە– ئاخاوتەی سیاسی و فەرهەنگیی کورد، دوێنێ و ئەمرۆ
نووسین: فەرهاد شاکەلی، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، چاپ: یەکەم، چ: ئاراس، ش: هەولێر، ژس: ٢٦، س: ٢٠١٠، ل:٢٤٧، ق:١٥×٢٣: بەشی سێیەم: بەسەرکردنەوەیەکی ئەزموونی ڕووناکبیرانی کورد/ شوکور مستەفا– لە نێوان پرسیار و ڕەخنەدا.

٦. کورد لە سوێد لە مێژووی ٢٥ ساڵەی فیدراسیۆنی کۆمەڵە کوردستانییەکاندا
کۆکردنەوە و نووسین: حامید گەوهەری، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، چاپ: یەکەم، چ: ئاراس، ش: هەولێر، ژس: ٢٧٥٤، س: ٢٠١٠، ل:٣٨٤، ق:١٥×٢١: کۆڕێکی ڕێزگرتن لە مامۆستا شوکور مستەفا.



# شوکور مستەفا
# پیرێ ئەندیشە و نامۆیی مەزهەرێ ناکۆکی



سەرۆ قادر

باسکردن لەسەر کەسایەتی مامۆستا شوکور مستەفا، بە ئاسان نازانم. ئەو قسەیە بۆ ئەوە ناکەم کارەکە زۆر بە ئاڵۆز بزانم، بەقەد ئـەوەی کەسایەتی شوکور تەنیا لە ڕوویەکەوە تەماشا ناکەم.

من، تەنیا بۆ ماوەی شەش ساڵ ئەوم لە نزیکەوە ناسیوەو خۆشبەختم کە ئەو شانسەم هەبوو، زۆر زوو متمانەی وەرگرم و برادەرێکی نزیکی بم. هەر ئەم لێکحاڵیبوونەش بووە مایەی لێکتێگەیشتنی فکریی و فەرهەنگیی. دانیشتنی دووردودرێژمان لەسەر بابەتی جیا جیا دەبوون، زۆر جارانیش لەوەدا تەنیا نەبووم و کەسانێک لێرەن، دەبوونە تەرەفێکی قسەکان. هەڵبەت ئەوەش دەزانم، کەسایەتیی شوکور مستەفا و کردەوەکانی، ڕەفتاری تاکەکەسێک بەتەنێ نەبوون، بەڵکو موڵکی میللەتێک بوو، بۆیە بە شێوەی جیاجیا، بۆ هەموان والاّ و ئاشکرا بووە. جاری یەکمم نییە کە ئێژم مامۆستا شوکور، لە چەشنی کەسایەتی فەردی و هەڵکەوتنیدا، زیاتر بیرمەند و ئینسانێکی تەئەمولیی بوو، نەک تەنیا وەرگێڕ و گـوازەرەوەی بیرو بەرهەمی کەسانی دیکە. جا ناکۆکی ئەم قسەیەی من و کارەکانی ژیانی ئەو لێرەدا دەردەکەون. هەموو کەس بۆی هەیە وەڵامبداتەوە: ئەدی ئەوە نییە ماۆستا هەموو تەمەنی خۆی بە وەرگێڕانەوە خەریک کرد؟

لەڕاستیدا، ئەو بارودۆخە سەختەی بە درێژایی تەمەنی مامۆستا، لە وڵاتی ئێمەدا هەبوو، نەک هەر ئەو بەڵکو سەمتی کارو بایەخ پێدانی سەرەکی لە زۆرینەی هەرەزۆری داهێنەرانی کوردستان گۆڕی. ئێمە شاهیدین کە چەندان داهێنەری باش، هەر لە هەنگاوی یەکەمیاندا کوژانەوە و ناچار دەبوون ڕوو لە کارێکی دیکە بنێن کە دەورووبەرو باری سیاسی مۆڵەتیان بدات. مێژووی سەدساڵەی وڵاتی ئێمە ئۆپەراسیۆنی کوژاندنەوە بووە نەک داهێنان. لە وڵاتێکدا هیچ ئارامی و ئالیکاری نەبێت و میللەت لە بندەستەیدا بتوێندرێتەوە و داخیلی کوێرەڕێی شێواندن و قەڵاچۆ بکرێ، چۆن بیرمەند و داهێنەری ئەدەبی گەشە دەکەن؟

هەڵبەت لەلایەکی دیکەشەوە تەجرەبەش سەلماندی، ئەوانەی تەریدەی هەندەران بـوون، نەگەیشتنە ئەو پلە بەرزەی داهێنان کە ئاماژەیان بۆبکرێ، ئەوە جیا لەو نامۆییەی تێیکەوتوون و حەوت قۆناغەرێ لە گونجان لە گەڵ میللەتی خۆیان دووركەوتوونەتەوە. داهێنەرانی هەندەرانیمان، نە ئێرەیین نە ئەوێیین، ئەوانە قوربانییەکانی ژانی ئاوارەیی و تەقەلای نەتوانەوەن لە تراوێلکەی غوربەتیدا. توانەوە لە ناوەوە و لەدەرەوە یەخەی داهێنەری کوردی بەرنەداوە. هەربۆیەش ترس و گومان و دڵەڕاوکێ و ئۆقرە نەگرتن سیفەتی زۆر دیاری ڕووناکبیرانی ئەم ڕۆژگارەی کوردانە.

جیلێک لە ناو کوردستان، لە شارەکان مانەوە و بیریان لە بەردەوامیی دەکردەوە. هەندێک بڕیاریاندا بە هەر قیمەتێک بێ، بەردەوام بن، ئەوانە قسەیان لەسەر زۆرە. هەندێکی زۆر کەمیش بیریان لە لاڕێ کـردەوە، بەڵام بە قیمەتی خۆیان، نەک بە پێوەری داگیرکاران. ئەوانە هەرچەند بۆیان نەدەلوا وەک خۆیان گەرەکیانە وابـڕۆن، بەڵام هەمیشە لقێک لە لقەکانی جێی ئیهتیمامی خۆیان دەگـرت و لە لاڕێوە چاوبڕکانێیان لەگەڵ ئەوە دەکرد کە دەبوا بیکەن و نەیاندەتوانی ڕاستەوخۆ دەستی لێبدەن. شوکور مستەفا نموونەی بەرجەستەی ئەم تیپە ڕووناکبیرانەی جۆری دووەمە کە من دەمەوێ باسیان بکەم.

مەسعود محەمەد، کە ڕەفیقی عومری شوکور بوو، بە ئاڵۆز کردن و کاڵکردنەوە، کارێکی زۆری لەسەر فکر کرد. پێموایە ئەوەشی بۆیە دەکـرد تا بتوانێ بـەردەوام بێت. کەچیی شوکور مستەفا هەوڵیدەدا شتانی نزیک لە حەزی خۆی وەرگێڕێتە سەر زمانی کوردی. ئەگینا لەکاتی قسەکردن یان وتار نووسیندا، قەت باسی ڕۆمان و ئەدەبیاتی نەدەکرد. مەجلیسی ئەو مەحشەری فکرو لێدان لە قەرەی قەدەغان بوو. بە پێچەوانەشەوە، ئەو لە نووسین دەترسا، دەچوو بە وەرگێڕان قەرەبووی دەکـردەوە. مناقەشە و پرسین ئەجا هەر مناقەشە، جێی کتێب نووسینەکانی ئەوی گرتبۆوە. هەر ئەوەش بوو، دوای ئازادی کە بەغدای بەجێهێشت و هاتەوە کوردستان، هەرچەند لە ساڵانی کۆتایی ژیاندا بوو، بەڵام حەزی مومارەسە کردنی خەمی سەرەکی ژیانی لەلا زۆر بەهێز بوو_ ئەویش نووسین و داڕشتنی بیروڕاکانی بوو. هەر ئەوەش بوو کاتێک من پێشنیارم پێکرد: مامۆستا شوکور، واز لە وەرگێڕان بێنە و قسە و ئەندێشەکانت بخەرە سەر کاغەز. زۆر جاران سەری خۆی ڕادەوەشاندو کە دەرۆیشت هەردوو دەستی بە لۆژەلۆژ بەخۆدا شۆڕدەکردنەوە. ئەمە نیشانەی کەوتنە ناو تەنگژەی نووسین بوو.

خزمینە، دوو کتێبە سەرەکییەکەی ئەو، شاهیدی ئەم قسەی منن( یەکەمیان ئەندیشە و هونەر.دووەم سەرچاوەکانی بیری کوردەواری). ئەو لەم دوو نووسینەیدا، زۆر وەستایانە هەوڵدەدات ساختومانی کۆمەڵایەتیی و بینای فکریی و فەرهەنگیی ڕۆژهـەڵات ئەوجا کوردستان ئاشکرا و شیی بکاتەوە. لە وەختێکی کەمدا درزی خستە ناو دەرگایەکی تۆکمەی تەمەن میژوویی ئێمە. بۆیە نابێ بە ئاسانی حوکم لەسەر کارە فکریەکانی مەلا شوکور بدرێ، پێموایە دەکرێ لە دوو لاڕا بخوێندرێتەوە: یەکێکیان شوکور مستەفا وەک

دیاردەیەک، دووەم فکرەکانی وەک داهێنانێکی زانستی و فەرهەنگی.

زۆر لەسەر دەوری مامۆستا شوکور لە بواری زماندا نارۆم، بەڵام زمانی ئەمڕۆی ئێمە، شاکاری دەستی هەژاری موکوریانی و شوکور مستەفایە. هەرچەند ئەو هەمیشە بە تەوازوعەوە دەیگووت: من پەیڕەوی شێوازی زمانی هەژاری موکوریانیم.

جیا لەو قسانە، ئەو لەسەر تیۆری زمانیش کارێکی زۆری کردوە و هەوڵیداوە سترۆکتۆری زمانی کوردی لە ڕووی مرۆڤناسیشەوە، شیی بکاتەوە و دەرگاکانی پێشکەوتن و یەکگرتنی زمانەکەمان بکاتەوە. ئەو کارەی لێمان بووە بە کێوی قاف و نازانین چۆن سەرەدەری تێدا بکەین.

شوکور مستەفا، نە ئیداری بوو، نە سیاسی بوو، نە حەزیشی لێبوو کەسایەتی کۆمەڵایەتی بێت. ئەو کارانەی کۆمەڵگا و دەوروبەر لێیان دەویست، ئەو نەدەیزانین و نەشیدەیکردن، بۆیە دایم وەک خۆی دەیگووت: دژایەتی دەکرا و تێینەدەگەیشتن کە ئەو مرۆی ئەندیشە و بیرکردنەوەی قووڵە. بیر لە بەزاندن دەکاتەوە نەک پەیڕەوکردن. چاکسازی دەویّ نەک جوانکاری ئەوەی پابەرجایە، ئەگەر لە شتێک نەگەیشتبا ملی لەبەر هەڵوەشاندنەوەی دەنا نەک پەرستنی. ئەو بەدوای لایەنە سابیتەکانی کۆمەڵیشدا دەگەڕا، ڕێزی دەگرتن بەڵام هیچ سابیتێک لای ئەو هەمیشەیی نەبوو، بۆیەش هیچ شتێک لای ئەو پیرۆز نەبوو.

جا ئەگەر هێمن و هەژاری موکوریانی دوو داهێنەری زمان و ئەدەبی بەرەنگاری بزووتنەوەی ڕزگاریخوازیمان بوون، ئەوە شوکور مستەفاو مەسعود محەمەد، جیا لە زمان، تاکە دوو داهێنەری فکریی بە درێژایی یەک سەدەمانن. بە هەر شێوەیەک بیر بکەینەوە لە کاریگەری ئەوان دەربازمان نابێ. لەم قسەیەمدا مەبەستم ئەوە نییە ئەوانە ڕەخنە هەڵنەگرن یان شایانی لێتێپەڕین نەبن، بەڵام ڕێچکەرێژ و پێشینەی فکری کوردستانی ئێمەن. من کە بیریان لێدەکەمەوە، سەربەرزی دامدەگرێ و لە شاگەشکەی سەرفرازیدا ددانەقرچە هەڵمدەلەرزێنێ.

## گوزارش و شاهیدییەك

کاتێک مامۆستا شوکور مستەفام بۆ یەکەمجار دیت، لە خۆمدا کەوتمە کێشەیەکی گەورە، منێک وام دەزانی ئەو کوردیزان و وەرگێڕێکی گەورەیە، چونکە هیچ نووسینێکی ئەوم لەسەر بیروئەندێشە نەخوێندبۆوە و نەمدەزانی لە بواری فەرهەنگ و فەلسەفەدا چەند قاتی ئەوەی کە پێی ناسراوە شارەزا و بلیمەتە. حەزم لە مەدح کردن نییە، بەڵام توانایی مامۆستا لەو بوارەدا کە کەمتر پێی ناسراوە، وام لێدەکات بێ ڕوودەروایسی بێژم شوکور لە بێبەختیی ئێمە ئینجا خۆی، بە هەڵە هەموو تەمەنی بە وەرگێڕانەوە خەریک کردووە. تێشم دەگەن کە قەت مەبەستم کەمکردنەوە لە بایەخی وەرگێڕانەکانی نییە.



شوکور مستەفا



بەڕاستیش تا پێش ساڵی ١٩٩٧ کە مامۆستا بە یەکجاری بەغدای بەجێهێشت و هەولێری کردە مەفتەن، بواری ئەوەی بۆ نەڕەخساوە بەبێ ترس و منەت، دەستان لە فەرهەنگ و فەلسەفە تاو بدات. ئەوە تەنیا چارەنووسی وە نەبووە، بەڵکو ئەو کاروانە تەپ و تۆزاوییەی کە دەیانی وەک ئەو تەمەنی خۆیان لە ناو گەردەلوولی زمان بڕینیدا دەبردەسەر، لە خۆیدا نوقمی دەکردن و ناچاری دەکردن لە پەرۆشی سەرەکی خۆیان دوورکەونەوە و بە چەنگەچرەی دیکەوە سەرقاڵ بن.

هەر کە بۆ جاری یەکەم بیستم هاتۆتە کوردستان، خۆم گەیاندێ و لە هوتێل شیرین پالاس وێڕای چەند ڕووناکبیرێکی دیکە لە دەوری مێزێکی زل وەکۆبووین.

ئەو قسەی دەکرد و جارجاریش دەیکردە نوکتەگێڕانەوە، دەیگەیاندە سنووری گاڵتە و زۆربەی قونکی قسەکانیشی بە (چوزانم)ێک بەجێ دەهێشت.

هەر ئەو کات لە گۆڤاری (ڕامان) گفتوگۆیەکی تێروتەسەلیان لەگەڵ کرد و ئەو بەشەشی کە لە گۆڤارەکە زیاد بوو، وێڕای سەرجەمی دیدارەکەی کردیان بە کتێبێک و دواجاریش لە هاوینی ١٩٩٨ لە دەزگای ڕۆشنبیریی گولان بلاومان کردەوە. برایان مەحموود زامدار و کاک ئازاد عەبدولواحید کارەکەیان بەڕێوەبرد. پێش ئەویش خۆم گفتوگۆیەکی دیکەم لەگەڵدا ساز کرد و لە هەفتەنامەی (گولان)دا بلاوکرایەوە. جیا لە گۆڤاری گولان العربی، رادیۆ و تەلەفزیۆنی گولانم تێگەیاند زنجیرەیەک باس و گفتوگۆی لەسەر زمان و فەرهەنگ لە تەکدا ساز بدەن. لەوێدا کاک ئەمیر فندی کارەکەی بەڕێوەبرد. دواجار خۆشم لە چەند دیدارێکی تەلەفزیۆنیدا ـ کە لە یەکێکیان هەمیشە زیندوو مامۆستا مەسعوود محەمەدیش بەشدار بوو ـ درێژەم بە باسەکان دەدا. کار وای لێهات مۆنتێری تەلەفزیۆنکە خۆی دەیگوت تێناگەم ئەم پیرەمێردە بۆ هێندە دێننە ناو بەرنامەکان، هەر کە لە پەردەی تەلەفزیۆنەوە پیرەمێردی دەدیت، دەیگوت: شوکور باشی مستەفا.

ئەوانە هەموویان دڵی منیان ئاو نەدا و نەگەیشتمە قەناعەت کە دەبێ مامۆستا شوکور هەر ئەوەندەی لە باردا بێت. دیدارمان فرە ببوون، هەر کە بە فرێک قورگی تەڕ دەکرد، من یەک دوو پرسیارم لێ دەکرد و ئەو دەبووە. زۆر جارانیش دەیگوت: کوڕی خاس خۆ ئەگەر تەسجیلێکت دانابا ئەم باسەمان لە هەموو جاران بە پێزتر دەبوو، لێ من پەلەم لە تۆمار کردن نەبوو، گەرەکم بوو لێی شارەزا بم و تێبگەم سەرگەی دەریاچەکەی لە کوێ پەنگاو دەداتەوە.

ئەم بەزمە شەش ساڵی ڕەبەق بەردەوام بوو. بەڕێز سەلاح بەدرەدین بە گاڵتەوە دەیگوت: واتکرد هەموومان بەجیدی بببنە موریدی شێخ شوکور مستەفا. شوکوریش دەیگوت: جا من خۆم چم، تا موریدم هەبن. کێشکە دەبێ گۆشتاوی چبێ...جارێکیان گوتم: نا نا هەی. دەستێکی بە ڕیشە هەڵپاچراوەکەیدا هێنا: کوڕە چوزانم.

ساڵێک لەوەوبەر، ڕۆژانە و بۆ ماوەی سێ مانگ سەر لە بەیانیان خۆم و ڕێکۆردەرێکی بچووک دەچوومە لای، نەک لە نادی و لە ماڵان، بەڵکو لە ژوورە بچووکەکەی ئەو لە کۆڕی زانیاری دەستمان بە قسان دەکرد. من پڕۆژەیەکی فکری و فەرهەنگی و فەلسەفی بیرلێکراوم چنیبوو کە شەش ساڵ بوو کارم تێدا دەکردو دەمزانی مامۆستا حەز لە دەربڕینیان دەکات. پڕۆژەی گوورین بووە نەخشەی ئاپارتمانێکی فەرهەنگی کە وەستایەکەی کارامەیەکی تەمەن هەشتا ساڵانە، ئەویش ئەم کتێبە و نووسەرەکەی شوکور مستەفایە.

گفتوگۆکان لەلایەن چەند لاوێکی ڕووناکبیر بە پوختی دەخرانە سەر کاغەز،دوای ئەوەی خرانە سەر کۆمپیوتەر، پرسیار و وەڵامەکانم دایەوە دەست خۆی. دوای گفتوگۆیەکی زۆر لە نێوانماندا، قەناعەتی هات سەرلەنوێ دایڕێژێتەوە و دەوڵەمەندتری بکات. لە خۆشیا لەسەر پارچە کاغەزێکی بچووک بۆم نووسی: هەر بژی پیرەمێردی ئازا.

پیرەمێرد کەوتبووە ناو ئیشەکە و شەو و ڕۆژ وردەکاریی تێدا دەکرد. بەرهەمی ماندووبوونی ئەو بووە ئەم کتێبەی بەردەستتان، کە پێموایە بۆ یەکەم جارە بیرمەندێکی کورد بە شارەزاییەکی شاهیدی بۆ دراوەوە کار لەسەر بنەماکانی فکر و فەرهەنگی کوردان دەکات. لێرەدا زمان، ئەفسانە، دین، تەسەوف، هونەر، مێژوو، وجوودیەت، ئەوجا مۆدێرنیتە و تەئویل و پۆست مۆدێرنیزم لێیان کۆڵدراوەتەوە. مامۆستا شوکور لە ڕوانگەی خۆیەوە شانی داوەتە بەر بژار و چاکسازی ناو فەرهەنگی (کولتوری) کوردی و سەرەتای پرۆسەیەکی مەزنی بنیادناوە کە لە خانەی لێکۆڵینەوە، ڕەخنە، داڕشتنەوەدا تیۆریزە دەکرێ.

لە ١٨ی ئەیلولی ٢٠٠٣دا، پیرەمێردێک لە تەمەنی هەشتا ساڵیدا، سەعات شەشی سەر لەبەیانی، زۆر بە زەحمەت دوا پشووی دایەوە و ئیتر وەرینەگرتەوە، چاوەکانی لێکنان، بەڵام دەمی خۆی دانەخست. کاتێک گەیشتمە سەری ئاوها بوو وەک باسی دەکەم. هەردوو دەستیشی بە حاڵەتی قسەکردن قرژ ببوون، ڕێک وەک هەمیشە. ئەوەی پێیان دەگوت شوکور مستەفا وەک خۆشی دەیگوت نازانم من کێم و چیم ئاوها دنیای بەجێهێشت.

شوکور مستەفا



رۆژی ١٤ی ئەیلول، بە تەلەفۆن بانگی لێکردم: ئەرێ ئەوە لەکوێی لێمان بووی بە هەنارە خۆشە؟ بە تەواوی دیار بوو پشووی هەڵماڵدراوە و قسەی باش بۆ نەدەهات. گوتم : خێرە وا دەنگت گۆڕاوە؟ پێی گوتم: ئۆکسژینم لێ قاتی بووە، دەتوانی سەرێکم لێ بدەی؟
لە کۆڕی زانیاری بوو، دەرگای ژورەکەیم کردەوە، لەپشت مێزە زل و قەرەباڵغەکەی کورژ دانیشتبوو. تاوتوێی دوا کتێبی نووسراوی خۆی ( ئەمەی بەردەستتان) دەکرد، کە منیش لە ئامادەکردنیدا هاوکاریم دەکرد. وەک هەمیشە دەیویست پێشوازیم بکات و لە شوێن خۆی رابێت، لێ دیار بوو تاقەت یاری نەدەکرد. خۆم گەیاندێ و نەمهێشت هەڵسێتە سەر پێ. خەمی ئەوە بوو نەیتوانیوە ئیندێکسی ناوەکان و فەرهەنگۆکی زاراوەکان ئامادە بکات. گوتی: سەگبابخێوە ئەم سینگەم نایەڵێ ئیش بکەم، هەناسەم نایەتەوە.
ڕەنگی بزرکا بوو، سپی وەک کەللە قەندی مێندوئاوی لێهاتبوو. جلەکانیشی وەک رۆژان پۆشتەو شیک نەبوو، تەنانەت پرچی خۆشی دانەهێنا بوو. ئەو بە هەناسەبڕکێ دەیویست تێمبگەیەنێ کە دەبوا کاری کتێبەکەی بە کۆتا گەیاندبا و منیش بە پەلە کاغەزەکانیم کۆکردەوە و خستمە ناو کارتۆنێک و پێیمگوت: عایدی من، هەستە با بچینە لای دکتۆرێک. لە ڕێگا دەم دەم دەیگوت: من لە مردن ناترسم بۆ هێندەم خۆ پێوە ماندوو دەکەی؟
لە نەخۆشخانەی کۆماری، خێرا فەحسیان کرد، دکتۆر پێی گوت: دڵت زۆر باشە، تەنیا پێویستت بە ئیسراحەتە.
لە پاش نیوەڕۆکەشدا سەردانی دکتۆری هەمیشەیی خۆیمان کرد، ئەویش هەندێک دەرمانی بۆ نووسی و هەمان پێشنیاری بۆکرد. رۆژی یەکشەممە، لە ماڵەوەیان تەلەفۆنیان کرد: مەلا داوات دەکات.
دیتم حاڵی قسەکردنی نییە. چوومەوە لای دکتۆرەکەی. گوتم من فلانم و تەندروستی مامۆستام بەلاوە گرنگە، وێدەچێ حاڵی باش نەبێ. دکتۆر بە مۆڕەیەکەوە گوتی: دەتناسم، بچۆ داخلی بکە. کە ژووری عیادەکەم بەجێهێشت، لای دەرگاکە ئاوڕێکم لێی دایەوە، ئەویش لە پشت عەینەکە زلەکانیەوە لە منی دەنـۆڕی. قەت نەمدیتبوو، لێ ئاکاری لە نەیارێکی سیاسی دەچوو، نەک پزیشکێکی مرۆڤدۆست. پێش بەجێی بێڵم، گوتم: ئەوە من هیچ، جەنابت مامۆستا شوکور دەناسی؟ گوتی: ئەدی.
مامۆستام تێگەیاند کە دەبێ داخلی خەستەخانە بێت و عینادیمان لەگەڵ نەکات. حاڵی شپرزە ببوو، سەرو پێی خۆی پێرانەدەگیرا، هەناسەبڕکێی بوو. بە لۆژە لۆژ چاکەتەکەی خستە سەر شان و هەر بە تراکسودەوە پێشمکەوت. گوتم ئەی پانتۆڵەکەت؟ بە بۆڵەیەکەوە: ئـەدی لـەوێ هـەر فڕێی نـادەم؟. گوتم: نابێ ئەوە پرۆتۆکۆڵە خۆ بە قسەی تۆ نییە. لەگەڵ هەڵکێشانی پانتۆڵەکەی، لە بن لێوان خەندەیەکی بە خینکەخینکی هەناسەبڕکێی هاتێ.
لە نەخۆشخانەی رزگاری، دکتۆرێکی گەنج هەردووکمانی ناسی، لە راپەراندنی پێداویستییەکان کوتایی نەکرد. دکتۆرێکی دیکە ئافرەت بوو، هات ناو و پێناسەکانی دیکەی لە فایلەکەیدا بنووسێت. پرسیی ناوت چییە مامە؟ منیش لێی چوومە پێشەوە: جارێ پێش ئەوەی نـاوی مامە بنووسی، تۆ رۆمانەکانی یەشار کەماڵت نەخوێندۆتەوە؟ ژنە ئەم قسەیەمی پێ سەیر بوو، وەڵامی دامەوە: من هەر کوردی ناخوێنمەوە.
مامۆستا شوکور، هەرچەند سات بە سات بەرەو پەشێوی دەرۆیشت، دەستێکی لێ هەڵوەشاندم و ئیشارەی بۆ دەمامکی ئۆکسژینەکەی سەر دەمی کرد کە لایبدەم. کاتێک دەمی بۆوە گوتی: ئەو دەمامکە دەڵێی پوزبەندی سەر قەپۆزی ئەو هێسترانەیە کە بۆ خەساندن دەیانخەن. ئەوجا خەندەیەکی کرد. منیش گوتم: دەڵێی زۆربای یۆنانیت تا دوا هەناسەش هەر پێدەکەنی.
هەرچەند بەجێمهێشت، چونکە دەبوو ئیستراحەت بکات، بەڵام زۆر نیگەران بووم. دەستی کوڕە مێرمنداڵەکەی خۆمم گرت و لە دەرگاکە هاتمە دەرەوە. سەهەند پرسی: بابە بۆ کەس بۆ نیگەرانی لەبەر دەرگا نەوەستاوە؟ ئەی بۆ لە ئێران بۆ شاملو و شەهریار خەڵک بەردەرگایان گرتبوو، لە تورکیاش کە شەعبان مرد ئەو هەمووە بۆی دەگریان.
لـەسـەرەوەڕا تەماشایەکی سەهەندی بچکۆلانەم کرد، بەهێواشی دەستیم گوشی، بەڵام قسەیەک نەبوو بیکەم. لەبەر دەرگاکە دوو پیرەژنی نەخۆش درێژ ببوون، کاتێک لەگەڵ مامۆستا دەچووینە ژوورەوە، ئەوان هەر لەوێ بوون. سەربارى حاڵی خۆی گوتی: کە ئەوانە دەبینم بۆ دایکم ئاگرم لە هەناوان بەردەبێ، ئەویش ئاوها لەبەر پەساران گیانی دەرچوو.
بە ڕێگاوە کە دەمهێنا، گوتی دنیایەو هەڵنەستامەوە، با چەند وەسیەتێکت لەلا بکەم، لەوانیش: ئەمن لە ژیانمدا خۆشیم نەدیت، لە ماڵەوە تا شوێنی کار، ئازاری خەڵکم

نەداوە، کەچی هەر لەخۆوە دژایەتی کراوم. کەم کەس لێم تێگەیشتووە، بۆیەش دایم لەم دنیایە بە یاخی ناسراوم و دنیاش بە هەموو سەختی خۆی بە ڕوومدا ڕادەپەڕێ.
پیرەمێردی زانا، دوای هەشتا ساڵ ژیان و نووسین و وەرگێڕانی دەیان کتێب و سەدان وتار و لێکۆڵینەوە، لە کاتێکدا لەسەر گردێکی بەرزی زانین وەستابوو، ئازارێکی باس دەکرد کە من دەبێ زۆر هەوڵ بدەم تا تێی دەگەم. ئەندێشەکانی ئەو شێوەنی ئینسانی بوون. شوکور مستەفا ڕۆژگار ناچاری کرد لە کاری نووسیندا بە لاڕێوە خەریک بێت، ئەگینا سەرباری بایەخی بەرزی وەرگێڕانەکانی، دەبوا ئەو بە نووسینەوە خەریک بێت، لێ لە بێ شانسی خۆی و میللەتەکەی هەر ئەوەندەی ڕێگا دەدرا کە دەیکرد و وەریدەگێڕا. زاتی شوکور مستەفا بیرمەند بوو نەک وەرگێڕ، مامۆستا بوو نەک گوێگر، فەیلەسووفێک بوو کە تەنیا لە ساڵی کۆتایی ژیانی بە جدی بە کاری خۆیەوە خەریک بوو، ئەویش لێکۆڵینەوە لەسەر فکر و گۆڕانکاری کۆمەڵایەتییە. بیروڕاکانی شوکور مستەفا زوو یان درەنگ جێی خۆیان لە ناوەندە زانستییەکان دەکەنەوە و ئەوەی ئەو پێی وابوو لێی تێناگەن، دەبێتە هەوێنی پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی میللەتەکەی.
ئەو بەیانییەی بە تەلەفۆنێک لە خەو هەڵسێندرام، کە لە هۆدەکەی نەخۆشخانە وەژوورکەوتم، پەتۆیەک بەسەر سەریدا درابوو، تاڵێک لە پرچە سپییەکەی بە ئالۆزی بەدەرکەوتبوو. ساتێک وەستام، بە ئەسپایی نێوچاوانیم ماچ کرد و چەند دڵۆپێک. پێم وانەبوو شوکور مستەفا نابێ قەت بمرێ، بەڵام مامۆستا و بـرادەرم بە ئاسانی بۆ دوا سەفەر پێ بەڕێ نەدەکرا. هەنگاوەکانم زۆر سارد بوون، لەو بەیانییەدا مامۆستا لە سەفەردابوو، سەهەندیش لە گەرمەی خەودا. بە تەلەفۆن ئەو تاقمە کەمەم ئاگادار کرد کە پێم وابـوو لە مامۆستا تێدەگەیشتن. مەهدی خۆشناو مشورخۆری ڕووناکبیران کەوتە ئاسانکاری بەڕێخستن، وەزیری ڕۆشنبیری مەحمود محەمەد بە بێ دەنگی بۆ ڕێزلێنان ڕاوەستا بوو، بارزانی مەلا خالید شانی بە دیـوارەوە لە ناوخۆیدا لە گوڕی گریاندا بوو. کاتێک بەرەو گۆڕستان بردمان، لە هاتنەوە من و کاروان ئاکرەیی لە باسی مامۆستادا نقوم ببووین، وامدەزانی ئەم تاقمە بچووکەی شوکور گەرەکی بوو، وەک تابلۆکەی ڕەشبەڵەکی هادی زیائەدینی، بۆ ئۆغری مامۆستایەک زۆر بەتاو لە هەڵپەڕیندا بوو.
لە کۆتاییدا دەبێ سوپاسی ئەو تاقمە لاوە ڕووناکبیرە بکەم کە لە کـارە تەکنیکییەکانی ئامادەکردنی ئەم کتێبەدا هاوکارییان کردم: ڕێبوار کەریم، سەلام سەعدی، جەلیلی عەبباسی، بەکر ئەحمەد و شیلان خانی تایپێستی کارەکانی مامۆستا. دەبێ بەتایبەتیش سوپاسی مامۆستا ڕێبوار سیوەیلی بکەم کە جارێک بە دیقەتەوە هەموو دەستنووسەکەی خوێندەوە و ڕێنوێنییەکی شایانی باسی کردم.

۲۰۰۳/۱۰/۲۱ هەولێر



یەشار کەمال — شوکور مستەفا

# مەلا شوکور... یاد و یادەوەری



د.عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ

شوکور مستەفا، زانا و نەترس و خوێندەوار بوو. ماوەیەکی زۆر لە ناوەندی و دواناوەنددا وانەی عەرەبیی دەوتەوە. بەڵام هەر حەزی دەکرد پێی بڵێن- مەلا شوکور.
ساڵی ١٩٤٨ ناسیم. من باوکم پاش (ناوەندی) ناردمیە کۆلیژی شەریعە. (ساڵم تەواونەکرد- وەک لە ژیاننامەی خۆمدا دیارە، لەسەر چالاکیی سیاسی دەریانکردم و هاتمەوە سلێمانی). ئەو پێشتر لە کەرکووک فەقێییەتی کردبوو، لەوێوە چووبووە (ناوەندیی ئەوقاف) لە بەغدا و پاشان لە کۆلیژی شەریعە وەرگیرابوو. لە بەزانین و موناقەشەکانی ناو دەرسدا قوتابییە عەرەبەکان دەیانوت: (خۆش عالم) واتە: زانایەکی باشە. ئەودەمەش کە موناقەشەی دەکرد - (بەتایبەتیی لەگەڵ مامۆستا میسرییەکاندا) دیاربوو کە بیری چەپی هەیە و لێی دەزانێ. هەر ئەوکاتە دەیگووت: لە کەرکووکەوە دۆستی زەبیحی و هەژارم. هەر ئەوسایش بێجگە لە کۆلیژی شەریعە، دەچوو لای مەلا سەعدوڵڵا دەیخوێند. کە مەلا سەعدوڵڵا یەکێک بوو لە مەلا کوردە ناسراوەکان و لە مزگەوتی (مەرجان) وانەی ئاینی بە فەقێکان دەووتەوە.
جارێک مەسەلەی فەلەستین هاتبووە پێشەوە، قوتابیی شەریعە هەموو چوونە دەرەوە و بۆناو خۆپیشاندان. پۆلیس هاتن و (موسەلەحە)یەکیان لەپێشەوە بوو. نازانم شوکور مستەفا لەکوێوە نەوت و پەڕۆی پەیداکرد و ئاگری لە موسەلەحەکە بەردا و پۆلیس هەڵاتن.
من پاش ئەوەش دۆستایەتیم هەر لەگەڵیدا مایەوە. کە دواناوەندیم تەواوکرد و چوومە خانەی باڵای مامۆستایان(کۆلێجی پەروەردە). هەر ڕۆژە ناڕۆژێک سەرم لەو و لەبرادەرەکانی تری شەریعەم دەدا.
یادگاری شەخسی و تایبەتی زۆرن بیگێڕمەوە، بەڵام

لەم چەند لاپەڕەیەدا جێگایان نابێتەوە. هەندێک سڵیش ئەکەمەوە. چونکە جارێک کە لە یادکردنەوەیەکدا ئەوەم گێڕایەوە کە (مەلا شوکور مستەفا) لە بنەماڵەیەکی ناسراوی سلێمانییە (ماڵی خوێ فرۆش) کە چەند کەسی ناوداریان تێدا هەبوو، بەڵام هەمیشە شانازیی بەوەوە دەکرد کە کوڕە هەژارە و بە هەژاری گەورەبووە و چەند بیرەوەریشی دەگێڕایەوە. یەکێک لە منداڵەکانی وتبووی- بۆچی وا باسی باوکم دەکات؟!

من ئێستا شانازی بەو گێڕانەوانەی ئەو و ئەو شانازی کردنەی ئەوەوە دەکەم بە (ڕەنجی شان) بەڵام بەجارێ لەوبارەیەوە پەردە هەڵنەدەمەوە و بچمە سەر نووسەری و زانایی و قەڵەمی (شوکور مستەفا).

دیارە لە کەرکووک - تورکومانی- فێربووبوو، هەر بە هۆی ناسینی (شەهید زەبیحی)یەوە جیاوازییە کەمەکەی نێوان تورکومانی کەرکووک و ئازەریش فێربووبوو. بەڵام هەوڵی بۆ ئەوەبوو کە تورکیی ئەستەمووڵ فێربێ. جارێکیش چوو بۆ ئەستەمووڵ و کۆمەڵێ قسەی خۆشی ئەوجارەیم لەبیرە.

بەڵێ تورکیەکە فێربوو. کەوتەوە وەرگێڕان لە تورکییەوە بۆ کوردی و بۆ عەرەبی. بەتایبەتی- ڕۆمانەکانی (یەشار کەمال). بەڵام لە کوردییەکەدا هەوڵی دەدا وشەی هەموو زاراوەکـان تێکەڵ بکات - کە باشی دەزانین - لەمەدا ڕێگەی (هەژار)ی گرتبوو. هەرچەندە من لام وایە ڕۆمان تا ڕەوان بێت و ناچارنەبێت بۆ زۆر وشە بچێتەوە سەر فەرهەنگ باشترە. (ئەمەش ڕایە).

یەشار کەمال، چەندجار کە خەڵکی لای ئێمەی دیبوو، سەلامی بۆ شوکور مستەفا ناردبوو. دیارە ئاگاداری کارەکانی بوو. لەو ساڵانەی دواییدا. کە برای کۆچکردوو (نەدیم داگ دەوران) - لە سوید کتێبخانەی کوردیی سەر بە حکوومەتی سویدی دەبرد بەڕێگەوە. مەلا شوکور مستەفا و منی کردبوو بە (ڕاوێژکار)ی کتێبخانە و بانگی کردین بۆ ستوکهۆڵم. بەڵام نەمانتوانی پێکەوە بچین. بەڵام کە لە سوید کاک (نەدیم)م دییەوە بۆیگێڕامەوە کە مەلا شوکور هات بۆ سوید، بەڵام من (واتە: نەدیم) لە ئەستەمووڵ دیتنی یەشار کەمالم بۆ ڕێکخست. هەردووکیان ئەو دیدارەیان زۆر پێخۆشبوو. بەڵام بەداخەوە مەلا شوکور نەیپەرژا شتێک لەبارەی ئەو دیدارەوە بنووسێت.

خۆزگە منیش دەمتوانی بە درێژی لەبارەی یەکتربینینی «گۆران و عەرەبی شەمۆ» بنووسم.

گەلێک قسەم پێیە لەبارەی ئەم پیاوە گەورەیەوە کە حەزی نەدەکرد بە گەورە بناسرێ.! بۆ هەق ئەوە دەڵێم کە کتێبی «مەئموون بێگ بن بێگە بەگ» زۆر پێش ئەوە وەرگێڕابوو کە وەرگێڕی دووەم بێتەوە وڵات- بەڵام مەلا شوکور ناوی ئەویشی خستە سەر کتێبەکە. قسەی زۆرم لەسەر هۆی ئەوە لایە.

نەمرێ یادی مەلا شوکور. با کاری گەورەی بۆ بکەین.



شوکور مستەفا — یەشار کەمال

# یادکردنەوەیەکی کورتی شوکور مستەفا



**محەمەدی مەلا کەریم**

پێشەکی داوای لێبوردن لە خوێندەوارانی ئازیزی گۆڤاری (ڕۆڤار)دەکەم کە ئەم چەند دێڕە نووسینەم لە بارەی ڕۆشنبیری گەورەی کورد و دۆستی خۆشەویستم مامۆستا شوکور مستەفاوە بابەتێکی وایان نەگرتووەتەخۆ شایانی تۆمارکردن و خستنە سەر کاغەز بێ، لەو ڕووەوە کە بەشێکی زۆری خوێندەوارانی کورد لێی بێئاگابن، لەبارەی ڕۆشنبیری مامۆستا شوکور و چالاکییەکانیەوە، لە بواری خزمەتکردن و گەشە پێدانی کولتوورو ئەدەبی کوردیدا، بەڵام ئەو خۆشەویستیەی من بۆ ئەو و ئەو ڕێزەی لەدڵمدا هەیە بۆی، لەوکاتەوە کە یەکترمان ناسیبوو، ئەو زیانە گەورەی کۆچی دواییکردنی ئەو بە ئەدەب و کولتووری کوردی گەیاند، بە بەراورد لەگەڵ ئەو دوارۆژە ڕوونەی لەسەر دەستی ئەودا چاوەڕوانی دەکرا بۆ ئەو ئەدەب و کولتووره، ئەگەر مەرگ فرسەتی بدایە ماوەیەکی باشی زیاتر بژیایەو خزمەتی بکردایەو پێویستی بەشداری کردن لەو هەنگاوە پڕ بایەخەدا کە ئەم گۆڤارە ناویەتی بۆ یادکردنەوەی مامۆستای کۆچکردوو، بە دەرکرددنی ژمارەیەکی تایبەت بەوەوە، ئەم گشت هۆیانە ڕێگەی ئەوەیان نەدام ئەوەندەی توانای ئێستام بەشداریی لەم بۆنەیەدا نەکەم.

منیش وەک دۆست و ناسیارێکی لە نزیکەوەی کاک شوکور تا ڕادەیەک ئاگادار لە پلەو پایەی ئەدەبیی ئەو، سەرباری ئەو نەخۆشییەی پتر لە چوار ساڵە بەدەستیەوە

دەنالێنم و لە جێگادای خستووم و رێگای پێوەندیکردنی بە دەرەوەی ماڵی لێ بڕیووم و پتر لە (٨٠٪ی) هەموو ئەو بابەتانەی لەیاد بردوومەتەوە، کە لە دڵ و دەروونمدا بوون و بەدرێژایی پتر لە ٨٠ ساڵ لای خۆمم خڕم کردبوونەوە، لە چوارچێوەی ئەو لەیادچوانەیشدا بیرەوەریی زۆری چەندین ساڵ ژیان لەگەڵ و لە نزیکی کاک شوکوریشدا لەبیر بردوومەتەوە. ئەگەر ئەم هۆیانە لەئارادا نەبوونایە توانای پڕکێشی کردنم نەدەبوو ئەم چەند دێڕە نیوەو ناتەواوە بنووسم، بەڵکو بتوانم چەند بڕگەیەک لەو شتانەم بێنەوە یاد کە لەبارەی مامۆستا شوکورەوە لەیادم بوون.

من پاش هاتنە سلێمانی ماڵمان لەبیارەوە لە ١٩٥١دا کە ئەو کاتە هێشتا فەقێ بووم، کاک شوکورم ناسی. وەک لە یادمبێ، ئەو کاتە کاک شوکور بووبوو بە مامۆستا لە یەکێک لە قوتابخانە ئامادەییەکانی سلێمانیدا. من وەک خوێندەوارێکی حوجرەو وەک دەناسراین، (فەقێ) بووم و چاوم بڕیبووە خوێندنی نوێ و ڕۆشنبیری نوی و، کاک شوکوریش کە یەکێک بوو لە بەرهەمەکانی ئەو جۆرە خوێندنەو لە فەقێیەتییەوە چووبووە کۆلێژی شەریعەو تەواویشی کردبوو و بووبوو بە مامۆستای ئامادەیی، منیش زۆرم حەز دەکرد بچمە کۆلێژی ناوبراو، بەڵام بۆم ڕێ نەدەکەوت.

ئێمە، من و کاک شوکور، سەرەڕای یەکێتیشمان لە جۆری خوێندنی ئەوکاتەی من و لەوەپێشی کاک شوکوردا، لە هەڵگرتنی بیروبۆچوونی نیشتمانپەروەری و ئازادیخوازیشدا هاوجۆر بووین. ئەمەیش مایەیەکی تری لێک نزیکی و توندوتۆڵیی پێوەندیمان بوو. بەم جۆرە ڕۆژ لە ڕۆژ زیاتر لێک نزیک دەبووینەوە، گەردشی ڕۆژگـار و سیاسەتی ڕژێم منی بـەرەو زیندان و دوور خستنەوە ڕاپێچ کرد. بەو جۆرە ساڵێکم لە زیندانی باقووبە و ساڵێکیش لە تاراوگەی بەدرە بەسەر برد. کە بەربووم ماڵمان چووبووە کەرکوک و تا ساڵێکیش پاش شۆڕش لەوێ ماینەوە، ئینجا چووینە بەغدا. پاش چەند ساڵێک دیسان گیرامەوە و سێ ساڵم لە زینداندا بەسەر برد. کە بەربووم و هاتمەوە بۆ بەغدا کاک شوکوریش ئەو کاتە نیشتەجێی بەغدا بوو، پێوەندیمان سەرلەنوێ تازە بووەوە و ئەم جارە دەرفەتی کاری هاوبەشیمان لەوەپێش گەلێ زیاتر بوو.

لەو ساڵانەدا یەکێتی نووسەرانی کورد لە بەغدا دامەزرا و لقی لەشارەکانی کەرکوک و هەولێر و سلێمانی و دهۆک کرایەوەو، بەشی هەرە زۆری چالاکانی بواری ئەدەبی کوردی بوون بە ئەندامی و گۆڤاری(نووسەری کورد)ی دەرکردو زووزوو کۆڕی ئەدەبی چ لە بەغدا و چ لە مەڵبەندەکانی لقەکان دەبەسترا، ئەوە بوو بەهۆی سەرهەڵدانی چالاکییەکی ئەدەبی فراوان لەو شارانەدا، هەروەها کۆمەڵێ ڕۆشنبیری کوردی لە بەغدا دانراو ئەویش گۆڤاری (ڕۆژی کوردستان)ی بە کوردی و عەرەبی دەرکرد، ئێمە هەردووکمان من و کاک شوکور، لە چالاکە دیارەکانی هەردوو کۆمەڵەکە بووین. دامەزراندنی ئەم دوو کۆمەڵەو دەرکردنی ئەو دوو گۆڤارە و کارایی هەردووکمان لەم کۆمەڵ و گۆڤارانەدا و بەتایبەتی لە یەکێتی نووسەرانی کورد و لە گۆڤارەکەیدا هۆیەکی گرنگی خەستتربوونی پێوەندی برایانەی هەردووکمان بوو، بەتایبەتی کە لەچەند دەورەی هەڵبژاردنەوەی دەستەی بەڕێوەبەری یەکێتی نووسەرانی کورددا ئێمەیش بووین بە ئەندام.

بـەڵام پاش ماوەیەک و لە ئەنجامی پەرەسەندنەوەی دیکتاتۆریەتی ڕژێم و بەتایبەتی سیاسەتی دژ بە دیموکراسی و بە میللەتی کورد، هەردوو کۆمەڵەی یەکێتی نووسەرانی کـوردو ڕۆشنبیریی کـوردی لە کارخران. دەرفەتی ئەو تێکەڵاویی من و کاک شوکوریش بە کۆچکردنی ئەو بۆ هەولێر لەیەک دوورکەوتنەوەمان کۆتایی هات.

مامۆستا مەلا شوکور ڕۆشنبیرێکی گەورەی ئەم سەردەمەی میللەتی کورد بوو. شارەزاییەکی باڵای لە هەردوو زمانی عەرەبی و کوردیدا هەبوو، هەروەها فارسییەکی باشیشی دەزانـی. بەهۆی پەروەردەبوونی لە منداڵییەوەیشی لە کەرکوک، تورکی و تورکمانییەکی چاکی کۆن و نوێی دەزانی. پاش تازەبوونەوەی ژیانی لە کوردستان، زۆری نەبرد، بە داخێکی فرە گرانمان، کۆچی دوایی کرد. زۆر بەوە دڵگرانم کە مێژووی ماڵئاوایی کردبێ لە ئێمەو دۆست و برادەرانی، نازانم

مەلا شوکور ئەگەر لە عێراقێکی ئازاد و دیموکراتدا ژیانی بەسەر بردبایە، خزمەتێکی گەلێ گەورەتری بە ڕۆشنبیریی کوردی و عەرەبی و تورکی و تورکمانی دەکرد، بەڵام سەد داخ ئەو هەلەی بۆ نەڕەخساو بە ناکامی سەری یەکجاری نایەوە.

وەک لە سەرەتای ئەم نووسینە کورتەمەوە هێمام بۆ کرد، بەهۆی ئەم نەخۆشییەی ئێستای چەندین ساڵەمەوە، بەشی هەرەزۆری ئاگاداری و بیرەوەرییەکانی خۆمم لەیاد

چووەتـەوە، بۆیە ئەگەر هەندێ هەڵە کەوتبێتە ئەم نووسینەمەوە، داوای لێبوردن لە خوێندەواران دەکەم و هیوای ئەوەم لێیان هەیە هەر کەسێ هەڵەیەکی تێدا بەدی کرد ڕاستی بکاتەوەو ڕاستکردنەوەکەی بۆ ئەم گۆڤارە بنووسێ.

## خەمێك دوای چل ڕۆژ

ئێمە ئەمڕۆ لە ماتەمینی کۆچی دوایی نـاوادەی زاناو بنووس و وەرگێڕ و توێژەرەوەی گەورەی ئەم چەرخەی کورد مامۆستا شوکور مستەفا، بۆ قەدر لێ زانینی و ڕاگرتنی یادی لە دڵماندا بۆ هەمیشە بە زیندوویی، لەم کۆڕەو لەم بارەگایەدا، خڕبووینەتەوە.

شوکور مستەفا بە کوێرەوەری و بێ باوکی چاویکردەوە، هەر لە منالّییەوە لە گوندانی ڕەسەنی دەوروبـەری کەرکوکدا و لە دەقنەو ڕاتبەی فەقێی ماڵە و ماڵ و کـۆلانـەو کۆلانی کـەرکوکـەوە بە قوولّی و بە وردی و بەربلاوی فێری زمانی دایک، زمانی شیرین و تەڕو پاراوی کوردی بوو، لەناو بازاڕی کەرکووکدا تورکمانی یادگرتووی، لەلاپەڕە کۆن و زەردەکانی کتێبی حوجرەوە بە زمانی عەرەبی ئاشنابوو، هەر لە سەرەتای ژیانیەوە، لەم بارودۆخە جۆر بەجۆرەدا پێگەیشتو و، هەر زۆر زوو دەرزی ئەو بێکەسییەی خۆی یاد گرت و لە ئاو و هەوای ئەو نەشەی ئازادیخوازییەوە کە لەپاش بڕانەوەی جەنگی دووهەمی جیهانەوە هەموو لایەکی عێراقی بەفراوانی گرتبوەوە، توانی و بۆی ڕەخسا لەو داوە ڕزگاری ببێ کە لەوانەبوو ژیانی فەقێیەتی توڕی ناو گەرداوی خۆی بدا کە ئەویش ژیانی مەلایەتییە، بەهرەی ئەویش وەک بەهرەی هـەزارانـی وەک خـۆی، بەدرێژایی ساڵەهای ڕابـــوردووی منالانی کـورد، لە چوارچێوەی تەسکی خوێندن و فێربوونی هەندێ کتێبی شەرع و نەحوو سەرف و بابەتەکانی دیکەی مەلایەتییەکی لە زۆربـەی زۆری حاڵەتەکاندا بە دەنگ هاواری زوڵاڵی چەرخەوە نەچوودا قەتیس بمێنێ.. بۆیە، هەر ئەوەندە کە ئاوزیای ئەو بۆ ژیانی مەلایەتی نەخولقاوە و ئەبێ ڕۆڵەی جیهانێکی تر بێ، ڕووی کردە بەغدا و قوتابخانەی هیدایەو ئامادەیی شەریعەت و پاشانیش کۆلێژی شەریعەتی تازە دامەزراو کە پتر فەقێی بەهرەمەندی حوجرەکانی پاڵ مزگەوتی تێدا وەرئەگیرا. لەوێ شانی دایە بەر خوێندنێکی لەچاو خوێندنەکەی حوجرەیدا گەلێ پێشکەوتوو و دەستی دایە خوێندنەوەی هەر کتێبێ بەر دەستی بکەوتایە و خۆی لەخوێندنەوەدا پابەندی هیچ سنووربەندییەک نەئەکرد. لەم ڕێگەیشەوە و لە هەندێ لەو هەڤاڵانەیەوە کە لەم قۆناغەی ژیانیدا ناسینی، بەشێوەیەکی بێ ئیلتیزام و لە زۆر جۆرە ئاش لێ کردوویش تووشی پەتای لەچاکبوونەوە نەهاتووی سیاسەت بوو، بێئەوەی لەم بوارەشدا خۆی بە تاقە لایەکەوە ببەستێتەوە. لە یەک کاتدا ئەیتوانی شیووعیشبێ و پارتیشبێ، کە لەو لەڕۆژەدا بەش بەحاڵی لاوانی نیشتمانپەروەری خوێنگەرمی کورد تاقە دوو ڕێگەی باوی سیاسەت بوون مرۆڤ لە دڵسۆزییەوە بۆ گەل و نیشتمانەکەی ڕوویان تێ بکا. لەو سەردەمەدا سیاسەت دووکـان و بازاڕ نەبوو، مرۆڤ بۆ کۆکردنەوەی مەتای دنیا ڕووی تێ بکا. ئەو کوردەی بیویستایە و بیوێرایە و لەخۆی ڕاببینیبایە سیاسەت بکا، ڕووی لەیەکێ لەم دوو ڕێگایە ئەکرد.

مەلا شوکر هەر لەو سەردەمەوە ئەوەندە چاو نەترساو و سـەرەڕۆ بـوو، سـەری بەهەموو یەکێ لەو کونانەدا ئەکرد کە بیری ئازاد و هەستی ئازادی لێیانەوە بەدی بکردایە و لەم پێناوەدا لەهیچ شتێ نەئەپرنگایەوە، بۆ نموونە ئەو یەکەمین کۆنە فەقێ بوو توانی لەڕێگای ئەو پەیوەندییە سیاسییە بێ سەر و بەرانەیەوە کە هەیبوون، بگاتە وارشۆی پایتەختی لەهستان و لەگەڵ نوماینەدەکانی لاوانی کۆمۆنیست و پارتی تێکەڵ ببێ و تاوێ بۆ سوودی ئەملاو تاوێ بۆ سوودی ئەولا، بەگوێرەی جۆری بابەت، بەشداری لە شەڕە دەنووکەکانیاندا بکات کە بەزۆری لەنێوانیاندا ڕوویان ئەدا، چونکە لەهەر لایەک شتەهایەکی بەدڵ و شتەهایەکیشی بەدڵ نەبوو. شتەهای وایش لەم یا لەولادا زۆر یا کەم نەبوون.

مەلا شوکور کە قوتابی کۆلێژی شەریعەت بوو، ئەبوو بەپێی داب و نەریتی کۆلێژ جبەیەکی درێژ لەبەر بکاو فێستێکی سووری مێزەرێکی سپی لێ پێچراو لەسەرنێ. قسە دێ قسە ئـەبـڕێ لـە یەکێک لـەدوا ساڵەکانی هەشتاکاندا ڕۆژێکیان، وەک زۆر ڕۆژ، لە ژوورەکـەی خۆی دانیشتبووین لە کۆڕی زانیاری، برادەرێک خۆی کرد بە ژوردا کامێرەیەکی بەدەستەوە بوو، شێخ عەلی قەرەداغیش بە جبەکەی بەری و مێزەرەکەی سەریەوە لەوێ بوو ئێمەش گوێمان بۆ مامۆستا شوکور شل کردبوو







لەڕاستەوە: ئازاد عەبدولواحید، حەمەی مەلا کەریم، شوکور مستەفا، مومتاز حەیدەری

باسی خوێندنی خۆی لە کۆلێژ ئەکرد کە چۆن ئەبوو بێ مێزەرە و جبە لەکۆلێژ نەچنە دەرەوە. بوونی شێخ عەلی لەوێدا و هاتنی برادەرە خاوەن کامێرەکەی بەهەل زانی، جبەکەی شێخ عەلی لەبەر کرد و مێزەرەکەی لەسەرناو خۆی کردەوە بە مەلاو وێنەیەکی دانسقەی بەو جبەو مێزەرەوە گرت.

هەر لەباسی جبەو مێزەری سەردەمی قوتابییەتی کۆلێژی مامۆستا شوکورەوە، جارێکی تریش قسە قسە ڕائەکێشێ، مەلا شوکور لەو ساڵانەی قوتابییەتیدا زۆر جاریش بەشداری خۆپێشاندانە سیاسییەکانی نەیارانی ڕژێمی کردووە. بەجبەو مێزەرەکەیەوە لە کۆلێژ ئەچووە دەرەوە و لە نزیکی شوێنی خۆپیشاندانەکەوە دایئەنان و وەک هەر ئەفەندییەک بۆ خۆی ئەچووە ناو خۆپیشاندانەکەوە و کە خۆپیشاندان ئەبڕایەوە یا پۆلیس هێرشی بۆ ئەهێنان و ئەکەوتنە وێزەیان و هەڵئەهاتن، مامۆستا بەپەلە پرووزە خۆی ئەکردەوە بەو شوێنەدا کەجبەو مێزەرەکەی لێ دانابوو و لەبەری ئەکردنەوە و بێ ترس و بێ پەروا بەناو ئاژاوەی ڕاوەدوونانی خۆپێشاندەران و پۆلیسدا تێئەپەڕی بەسەلامەتی ئەگەڕایەوە بۆ کۆلێژ.

ئەم جبەو مێزەرەیە کاک شوکوری لە گەلێ تەنگاو دەرباز کردووە. تەنانەت خۆی ئەیگێڕایەوە جارێکیان لەگەڵ یەک دوو برادەری کۆلێژیدا لە بارێک بوون خواردوویانەتەوە، هەستیان کردووە کەوا کەسانێکی ناسیاو دێن بۆلایان لەوانەی نابێ بزانن ئەمان ئەخۆنەوە، هەر یەکە دەستیان بردووە فێست و مێزەرەکەی سەریان لە کیسەیەک دەرهێناوە کە لای پێی خۆیاندا دایاننابوون و ناویانن بەسەر پێکەکەی بەردەمیانەوە.

لەبارەی سوودی ئەم جۆرە کاتانەی ئەم فێست و مێزەرەی سەردەمی قوتابییەتی خۆیەوە، مامۆستا شوکور گەلێ شتی خۆشی ئەگێڕایەوە، بەڵام ئەیشیوت گەلێ جار بەدەستییەوە گیرم ئەخوارد و ئەبوو بەهۆی لێ زەوتکردنی گەلی توانای هەڵسووڕانی سەربەستانەم.

مامۆستا شوکور هەر کە کۆلێژ تەواو ئەکاو ئەکرێ بە مامۆستای ئامادەیی لە بەعقوبە، خەباتی سیاسیی و ئەرکی مامۆستایەتییەکەی لەیەک دەئاڵێنێ و چ لەوێ و چ لەکەرکوک کە دەرسی بەرنامەی قوتابخانە بە قوتابییەکانی ئەڵێتەوە لە هەمان کاتیشدا مامۆستایەتی نیشتمانپەروەرییەکی خاوێن و بێ گەردیان ئەکات. چەندین وەچەی قوتابیان لەسەر دەستی مامۆستا شوکوردا بوون بە نیشتمانپەروەر و تێکۆشەری ڕێگای ئازادی ئەم گەلە. لەپاش شۆڕشی ١٤ی تەمووزیش مامۆستا شوکور ئەم ئەرکەی سەرشانی خەستو خۆڵانەتر لە سلێمانی بەڕێوە

بردووە. لەوێ لە نزیکەوە هاوڕێی گۆرانی شاعیر بووە، بەڵام زۆری نەخایاندووە بە گواستنەوەی ئەم بۆ کەربەلا و بەدەست لەکارکێشانەوەی ئەو و گواستنەوەی بۆ بەغدا لێک جوێ بوونەتەوە. مامۆستا شوکور ساڵانێکیشی لە کەربەلا بەسەر بردووە و لەپاش کودەتای شوومی ١٩٦٣ تووشی گەلێ چەرمەسەریی بووە تا لە دوا ساڵانی شەستەکاندا گوێزراوەتەوە بۆ بەغدا و لەوێ لە بەڕێوەبەرێتی خوێندنی کوردی دانرا. ناسیاوی بەگەرمیی بەندە و مامۆستا شوکور لە نزیکەوە لەم ساڵانەوە دەست پێ ئەکا کە منیش لەو سەردەمەدا تازە لە زیندانی دووهەم جاری سێ ساڵەم دەرچوو بووم و لە ڕۆژنامەی تەئاخی و بەشە کوردییەکەی کارم ئەکرد.

لەم ساڵانەدا مامۆستا شوکور هەندێ بابەتی ئەدەبی منداڵانی کە لە بۆلگارییەوە کرابوون بە تورکی وەرئەگێڕایە سەر کوردی و ئەیهێنان بۆمان بۆ (برایی) لەوێدا بڵاومان ئەکردنەوە. من کە ئەم بەرهەمانەی مامۆستا شوکورم ئەدین و یەکەمجار بوو بابەتێکم ئەدی بە قەڵەمی ئەو هاتبێتە بەرهەم، زۆری پێ ئەگەشامەوە کە بە کوردییەکی چەندە ڕەسەن و ڕەوان ئەنووسێ و بۆیە هانمان دەدا زیاتر خەریکی نووسین بە کوردی و وەرگێڕان بۆ سەر کوردی بێت، خوا کردی لەوەدا سەرکەوتوو بووم کە ئەم کەڵکەڵەیە بخەمە کەللەی و ببم بە مایەی خستنە سەر پێ لەوەپێش نەگرتووەبەری وەرگێڕان و نووسین و ئەو وەرگێڕ و بنووسەی لێ دەرچێ کە تامابوو لەناو کورددا دانسقە بوو. مامۆستا شوکور لە نووسراوێکیدا کە بڵاویش کراوەتەوە و ڕەنگبێ کەسانێ لە برادەرانی دانیشتووی ئەم کۆڕە بەرچاویان کەوتبێ و لەیادیان بێ، لەم ڕاستییە دوواوە کە فلانکەس منی خستە سەر کەڵکەڵەی نووسین و وەرگێڕان. بەڕاستی منیش شانازی بەم شەرەفەوە ئەکەم کە بەشداریم لە خولقاندنی بەهرەمەندیکی تا ئەوکاتە پەی بە بەهرەی خۆی نەبردووی وەک مامۆستا شوکوردا ببێ و پێم کرابێ وای لێ بکەم دەست بداتە خامە و نووسین بکا بە پیشەی هەمیشەیی خۆی، کە وادیارە خواوەند خۆیشی هەر بۆ ئەم کارەی خولقاند بوو.

لەو کاتەوە تا دوا ڕۆژی ژیانی، من و مامۆستا شوکور، دۆست و برادەرێکی ڕاستەقینە بووین و من هەمیشە ئەوم بە مامۆستای گەورەی خۆم و زۆری وەک خۆم و لەمنیش زیاترم زانیوە و ئەگەر جاروبارێکیش توێژاڵێکی گەرد ڕووی پەیوەندیمانی گرتبێ، من پڕ بەدڵ پێم ناخۆش بووە و لەوە ناڕازی بووم بۆیەش زۆری نەبردووە هەردوولا گەڕاوینەتەوە سەر دۆخی جارانمان.

هەر بە هاندانی بەندەش بوو مامۆستا شوکور ئەو چیرۆکە بولگارییە بەکوردییە کراوانەی خۆی کە لە براییدا بۆمان بڵاوکردەوە، کۆی کردنەوە و لە دووتوێی بەرگی کتێبێکی خنجیلانەدا بڵاوی کردنەوە و ئەوە یەکەمین بەرهەمی بڵاوکراوەی بوو لە شێوەی کتێبدا.

هەر لە سەرەتای دامەزراندنی کۆڕی زانیاری کوردیشەوە من هەمیشە داوام لە برای ئازیزم ئەمینداری گشتی کۆڕ دکتۆر






شوکور مستەفا لەسەر گۆڕی هێمن

کەمال مەزهەر ئەکرد کە مامۆستا شوکور ڕاکێشن بۆ کۆڕی زانیاری، بەڵام وەزارەتی کاروباری باکوور کە بەڕێوەبەرێتی خوێندنی کوردی سەر بەو بوو، کاری زۆری بە مامۆستا شوکور هەبوو، مامۆستایش لە مەسەلەی ساغکردنەوەی ئەو قوتابخانانەی پارێزگاکانی موسڵ و کەرکوک و دیالەدا کە ئەبوو بە کوردی تیایاندا بخوێنرێ و کاربەدەستانی وەزارەتی پەروەردە کە بەشی زۆریان لە بەعسییە کوردی نەویستەکان بوون و تەگەرەی فرەو فراوانیان ئەهێنایە ڕێی پێخوێندنی کوردی کە ئەبوو بەپێی ڕێکەوتنامەی ١١ی ئازار سەری بۆ بنەوێنن و جێبەجێی بکەن، دەورێکی ئازاو بوێرانە و چاونەترسی ئەگێڕا، دڵی نەئەهات دەست بەرداری مامۆستا شوکور ببێ و بهێڵێ بیگوێزنەوە بۆ کۆڕ. جا کە شەڕی کوردستان دەستی پێکردەوە و بەعسییەکان ڕێگایان بۆ چۆڵ بوو چی بە پێخوێندنی کوردی ئەکەن بیکەن، مامۆستایان لەبەڕێوەبەرێتی خوێندنی کوردی دوور خستەوە و گواستیانەوە بۆ پێخوێندنی سانەویی و کۆڕی زانیاریش لەوێوە هێنای بۆ لای خۆی.

بەندە لەو سەردەمەدا لە یەکێتی سۆڤیەت بووم. کە گەڕامەوە بۆ بەغدا و چوومەوە کۆڕ، لەوێ چاوم بە دیداری کاک شوکور، وەک کاربەدەستێکی کۆڕ، ڕۆشن بووەوە کە گوێزرابوەوە بۆ ئەوێ. قۆناغێکی تری دۆستایەتی من و کاک شوکور کە گوێزرابوەوە بۆ کۆڕ، لەو ڕۆژانەوە دەست پێ ئەکات.

تا من لە دەرەوە گەڕامەوە کاک شوکور لە وەرگێڕانی (قەڵای دمدم)ەکەی عەرەب شامیلۆڤ بوو بووە و لە چاپخانەی کۆڕ خستبوویە ژێر چاپ. لەوەلاش (ئەفسانەی چیای ئاگرین) و (کوێر ئۆغلی) و (تەنەکە)ی یەشار کەمالی وەرگێڕایە سەر کوردی. لە دوو کتێبی پێشووی ئەم سیانەدا من هیچ دەورێکم نەدی، بەڵام (تەنەکە) و چاپی دوومی قەڵای دمدم، لەسەر ئەرکی من لەچاپ دراون و پاش فرۆشرانیان ئەرکی چاپەکەم وەرگرتەوە. لەڕاستکردنەوەی هەڵەی چاپی (کاریتە) و (زەوی ئاسن و ئاسمان مس)یشدا هاوکارییەکی زۆرم لەگەڵ کرد و لەڕێگای چەندین جارێکەوە خوێندنەوەی ئەو دوو کتێبەوە لە هەر نووسینێکی زیاتر شارەزای بەهرەی بێ سنووری کوردی جوان زانینی و جوان نووسینی مامۆستا شوکور بووم). شانۆنامەی (شێخ پەدرەددین کوڕی قازیی سیماونە)ی نازم حیکمەتیش هەر من بۆم لەچاپ دا. کە تابلۆیەکی نازدار و هەمەڕەنگی خستە ڕووی کاغەزو ڕووی شاندی خەبات لەپێناوی ڕەنجکێشاندا، بەکورتی لەزۆر لە کارە ڕۆشنبیرییەکانی مامۆستا شوکوردا من وەک شاگردێک لەبەردەستیدا بووم، چونکە بەڕاستی بایەخی کاری نووسین و وەرگێڕانیم زۆر باش ئەزانی و لەبەر ئەوە ئەبوو هەرچیم پێ بکرایە. بۆ ئەوەی چالاکانەتر بجووڵێتەوە، بیکەم.

لەسەردەمی سەرەتای کەوتنە کاری نووسینیشدا مامۆستا شوکور لە کارەکەیدا خاو و خلیچک و سارد و سڕ بوو، وام هەست ئەکرد باوەڕی بەخۆی و بەتوانای خۆی نەبێ، بەڵام کە لەگەڵ وەرگێڕانی هەر بەرهەمێکیدا پێشوازی جەماوەری خوێندەوارانی لەکارەکەی ئەدی، وره و متمانەی بەخۆی چەند قات زیادی ئەکرد. سەردەمێکی کەمیش بوو بە ئەمینداری گشتیی کۆڕی زانیاری. لەم سەردەمەدا ئەبوو بەشێکی زۆی کاتی بەڕێوەبردنی کاروباری بەڕێوەبەرێتی کۆڕەوە بەرێتە سەر. دڵی بەمە خۆش نەبوو چونکە بەشتی واوەی سەرقاڵ ئەکرد کە لە قوڵایی دەروونیدا ئەیزانی بۆ ئەوە دروست نەبووە، بۆیە کە کۆڕی زانیاری کوردیان هەڵوەشاندەوە و کار بەدەست و مووچەخۆرەکانیان خستە سەر قەوارەی کۆڕی زانیاری عێراق و پلەی (خەبیر) یان بۆ ئەو دەستنیشان کرد، سەری سووک بوو. لەو ماوەیەشدا کە من وەک کرێکارێکی کاتیی لە کۆڕ نەمام و هەموو ئەرکی دەرکردنی گۆڤارەکەی کۆڕ کە تا ئەوکاتە لەسەر شانی من بوو، هەمووی کەوتە ئەستۆی ئەو، چونکە کەسی تر لە کۆڕ نەما بتوانێ ئەو کارە ڕاپەڕێنێ، ئەو بارە لەسەر دڵی مامۆستا شوکور زۆر گران بوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا دەستی لەو کارانە هەڵنەگرت، کە بۆ خۆی ئەکردن. وەرگێڕانی یاداشتەکانی مەئموون بەگی کوڕی بێگەبیگ کە بەهاوکاری لەگەڵ شەهید مامۆستا مەلا جەمیلی ڕۆژ بەیانی کردی و بەشدارییەکەی مامۆستا مەلا جەمیل بریتیبوو لە نووسینی پەراوێزەکانی کتێبەکەو، مێژووی ئەردەڵانی مەستوورەی ئەردەڵانی کە لەگەڵ د. حەسەن جاف کردویانە بە کوردی و کتێبەکەی ئەسکەندەر شەمی لەمەڕ شەرەفنامەکەیشیان ئەڵقە ئەڵقە لە گۆڤاری دەستەی کوردی کۆڕی زانیاریدا بڵاوی کردەوە و پاشان لە هەولێر بەشێوەی کتێب لەچاپیداو چەند کتێبی تریش کە لەلایەن کۆڕی زانیاری یان دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردییەوە بڵاوکرانەوە. دیارە نابێ (شعر لشاعیر لکردیی المعاصر عبدالله گوران)ی حسێن عەلی

لەیاد بکەین کە کاک شوکور وەریگێڕایە سەر عەرەبی و دەزگای ڕۆشنبیریی کوردی لە ١٩٧٦دا بۆی بڵاو کردووەتەوە.

مامۆستا شوکور پاش خانەنشین کردنی ماوەیەک بە نەخۆشی (دۆژ دامان — کەئابە)وە ناڵاندی کە لام وایە ئەو نەخۆشییەی لە ئەنجامی دوورکەوتنەوەی لەپڕی لە کۆمەڵ و لەو هەموو دۆست و برادەرانەبوو کە هەمیشە لە کۆڕ سەریان لێئەدا و بە دەورووپشتیەوە بوون و بەر لە هەرکەسی تر سەریان لەو ئەدا. ئەیشبوو هەروابێ، چونکە لەو خوێندەوارتر و خاوەن بەهرەتر لە کۆڕدا نەبوو کەس سەری لێبدا. ئەم ماوەیەی لەماڵەوە پتربێ، هێشانە بەرهەمی هیچ نووسراو و وەرگێڕاوێک بەسەر ئەبرد.

ئەوەی لەم قۆناغەی ژیان و کاری مامۆستا شوکوردا وەک داخێک هەر لە دڵما ماوە ئەوە بوو کتێبێک بە یەکێک لە زمانی تورکی نەژادەکانی ئاسیای ناوەڕاستەوە هاتبوو بۆ کۆڕ، شیکردنەوەیەکی ماتریالیانەی مارکسیی تەریقەت و بەتایبەتی تەریقەتی نەقشبەندی ئەکرد، زۆری بەدڵبوو، زۆری بۆ باس ئەکردم. بۆیە هەر زوو پێشنیارم بۆ کرد کە بیکات بە عەرەبی یا بە کوردی، بەڵام هەرچەند جاروبارێکیش گفتی ئەدامێ هەر نەیکرد. نازانم نەیئەویست خۆی باوێتە گومەزی پەیڕەوانی ئەو تەریقەتەوە، یا لەبەرچی. من بۆ خۆم داخی وەرنەگێران و بڵاو نەکردنەوەی کتێبێکی وام هەر لەلا ئەمێنێ.

هەرچەند زۆرتان (تاریخ الاماره البابانية) و پێشەکییەکەی بەندەتان دیوە، ئەمەوێ چەند وشەیەکیشتان لە بارەی سەرچاوە و دەسنووسی ئەم کتێبەوە عەزر بکەم:

لە ساڵی ١٩٨٢ دا پاش ئەوەی دەسنووسی ئەو کتێبەم دابووە مامۆستا شوکور مستەفا تەماشای بکاو بزانێ شایانی ئەوەیە خۆی بە وەرگێڕانیەوە خەریک بکا، دەستی کرد بە وەرگێڕانی بۆ عەرەبی و منیش هەرچەندی ئەو وەریئەگێڕا دەستم ئەدایە داڕشتنەوەی، ئەگەر بۆ سەر عەرەبی وەرگێڕابایە یا ئەمکرد بە عەرەبی ئەگەر ئەو بە کوردی و جاروباریش بە فارسی و تەنانەت بە زەنگنانەی وەرگێڕابایە کە زۆر لە هەورامیانەوە نزیکە، بەڵام تەواومان نەکرد و تێیدا ڕاوەستاین تا لە ساڵەکانی نەوەدەکاندا تێهەڵچووینەوە و لێبووینەوە. ئەوجا هاتینە سەر ئەوە کە من هەموو ڕۆژێ ئەچووم بۆ ماڵیان و بەشێکم لە وەرگێڕدراوە سەر عەرەبییەکە بۆ ئەخوێندەوە و ئەویش دەسنووسە تورکیەکەی ئەگرت بەدەستەوە و بەراوردی تێکستی تورکییەکە و وەرگێڕدراوەکەی خۆی ئەکرد کە من دامڕشتبوو بۆم ئەخوێندەوە. دەرکەوت کارەکە زۆر بە پوختی کراوە و هیچ هەڵەیەک لە وەرگێڕاندا نەکەوتە پێش چاومان.

لێرەدا ئەبێ بۆ ئاگاداری هەموان ئەو ڕاستییە بدرکێنم کە لە پێشەکیی کتێبەکەدا نەموتووە. من ئەو دەسنووسەم پێش لە سێدارەدانی شەهیدان شەهابی شێخ نووریی شێخ ساڵەح و هاوڕێکانی لە دەستی برای ئازیزم دوکتۆر کەمال مەزهەر وەرگرتووە کە لەگەڵ دەسنووسی دیوانەکەی شێخ نووریدا لای شێخ شەهاب بوون و دکتۆر کەمال هەردووکیانی بە ئەمانەت لای من داناو پاش چەند ساڵ کوڕەکانی شێخ نووری داوای دەسنووسی دیوانەکەیان کردەوە لە دوکتۆر کەمال تا کاک ئازاد عەبدولواحید ئامادەی بکا بۆ چاپ و منیش دامەوە دەستی دکتور کەمال. هەرچی دەسنووسی مێژووی بابانەکەش بوو، ئەوە هەر لای من مایەوە تا پاش لەچاپدانی وەرگێڕاوە عەرەبیەکەی و ئەو کاتە ئەویشم هەر دایەوە دەستی دکتۆر کەمال.

بگەڕێینەوە بۆ لای من و کاک شوکور. پاش ئەوەی نەخۆشی دۆژ دامانەکەی چاک بوو و هاتەوە سەرخۆی پێکەوە سەرێکمان لە هەولێر و سلێمانی داو لە هەولێر بەسەر لێدانی بەڕێز کاک مەسعود شەرەف مەندبووین. قسە و گفتوگۆی نێوانمان کێشایەوە بۆ مەسەلەی شەڕی خۆ کوژیی نێوان پارتی و یەکێتی و ئەو قسانەی لە کاک مەسعودمان بیست هانیان داین بچینە قەلاچوالانیش و سەرێک لە بەڕێز مام جەلالیش بدەین و قسەکانی کاک مەسعودی بۆ بگێڕینەوە و لەوێشەوە دیسان بێینەوە بۆ سەری ڕەش و قسەکانی مام جەلال بۆ کاک مەسعود بگێڕینەوە و بەم جۆرە سێ جار سەرمان لە هەر کام لەو برادەرانە دایەوە لەو ئاستەدا ڕاوەستاین، چونکە لەو ڕۆژەدا و بۆ ئێمەی بەغدانشین لەبەردەستی ڕژێمی خوێناویی بەعسی سەدامدا، لەوە زیاترمان لەتوانادا نەبوو، ئەنجامی هاتووچۆکەی خۆمانمان خستە سەر دەستی هاوڕێ عەزیز محەمەد کە بەگەرمی دەوری ناوبژیوانکەری نێوان هەردوو لای ئەبینی. ئەو ڕۆژانەی شەڕی خوێنڕێژی لەنێواندا نەبوو، بەڵام لە هەردوولا داگیرکردنی ماڵی کەسانی سەبەولاو وەدەرنانی خۆیان بۆ لای ئەولا بەگەرمی بەردەوام بوو، بێ گومان ئاشتی لەسەر

شوکور مستەفا



بنەمای ئەم هەوڵ و تەقەلا ناچیزەی من و مامۆستا شوکور بەرپا نەبوو کە حیزبی کۆمونیستی عێراق و کوردستانیش زۆر بە گەرمی پیرۆزبایی ئەم هاتووچۆیەیان لێ ئەکردین و هانیان ئەداین لەسەری بەردەوام بین و هەموو جارێ حیزبی کۆمۆنیستی کوردستان هۆی هاتووچۆی بۆ فەراهەم ئەکردین. بەڵام دیارە ئێمەیش هەرچۆنبێ بەشێکمان لەجێگیر کردنەوەی ئاشتیدا بۆ سوودی گەل و نیشتمانە ئازیزەکەمان بەرکەوتووە و ئەوە بەمایەی شان و شکۆیەکی پایەدا ئەزانم بۆ هەردووکمان.

پاش ئەو سەفەرە یا هەر لەو سەفەرەدا مەسەلەی پێکەوەنانی کۆڕی زانیاری کوردستان هاتە ئاراوە و لەڕێگای کاک بەدران ئەحمەد حەبیبی بەڕێوەبەری ئێستای دەزگای ئاراسەوە پێشنیازی ئەوە بۆ هەردووکمان کرا کە بێینە هەولێر و بەردی بنەڕەتی کۆڕی زانیاری کوردستان لەسەر شانی ئێمە دانرێ، هەردووکمان پێخۆشحاڵیی خۆمان بەوە دەربڕی، بەڵام بەندە داوای ئەوەم کرد کە ئەم گفتە سەرەتاییەم لەسەر نەکرێ بە ماڵ تا پرس بە باوکم ئەکەم و ڕەزامەندی ئەو وەرئەگرم. کە گەڕامەوە بۆ بەغدا و مەسەلەکەم بۆ باوکم گێڕایەوە پێخۆشحاڵیی خۆی دەربڕی و پیرۆزبایی لێ کردم و منیش کە دیسانەوە لەگەڵ کاک شوکور هاتمەوە بۆ هەولێر ڕەزامەندی دواجاری خۆمم پیشان دا، بەڵام کە کاک شوکور گواستیەوە بۆ هەولێر من نەمتوانی بێم چونکە سەلاحی برام لەو ڕۆژانەدا بەغدای بەجێهێشتبوو کەس لای باوکم نەئەمایەوە و منیش لەبەر پیری و پەککەوتەیی باوکم ڕەوا نەبوو بەجێی بهێڵم، چونکە کە بەجێم هێشت ئەبوو تا ڕژێمی سەدام لە رووی کاردا بێ، روو نەکەمەوە بەغدا و نەیبینمەوە و تەنانەت ئەگەر کۆچی دواییشی بکردایە ئەبوو بتوانم لە پرسەکەیدا لە بەغدا بەشداری بکەم.



ئازیزان!

مامۆستا شوکور بە هاتنە هەولێری گەڕایەوە تەمەنی ٣٠-٤٠ ساڵان و بەعەقڵ و مەعریفەت و ڕۆشنبیرییەکەی ئەو ڕۆژەیەوە. ئەو چەند ساڵەی کاک شوکور لە هەولێری پێتەختی کوردستانی ئازاد و لە کۆڕی زانیاریی کوردستاندا بەسەری بردن، دەوڵەمەندترین و بە پێزترین ساڵانی ژیانی و پڕ دەستکەوترینیان بۆ کولتووری کورد. لەم ساڵانەدا چەندین بەرهەمی سیاسیی و بیریی و مێژوویی پڕ بایەخی وەرگێڕاوەتە سەر کوردی و عەرەبی چەند بەرهەمی نایابیشی بۆ خۆی نووسیوە و چەندین وتاری گرانبەهای لە گۆڤار و ڕۆژنامەکاندا بڵاوکردووەتەوە و لە چەندین کۆڕی تەلەفزیۆنیدا بەشداری کردووە، کە بێگومان زۆرتان یا بەشێکیانتان دیوە و دیارە لە بەندە پتر لێیان بەئاگان، ڕاستان ئەوێ کاک شوکور ئەو بەرهەمانەی خودی خۆی بڵاو نەکردبووەوە، من لام وابوو، وەک گەلێ کەسی تریش لایان وابوو، خوا مامۆستا شوکوری تەنها بۆ وەرگێڕان خولقاندووە و تاقەت و توانای نووسینی خودیی و توێژینەوەو ئەنجامگیریی نییە. بەڵام بەو بەرهەمانەی خۆیدا کە لە هەولێر نووسینی و بڵاوی کردوونەتەوە، بەڕاستی دەرکەوت کە منیش و هەموو ئەوانەیش کە لەم ڕووەوە وەک من بیریان ئەکردەوە بەهەڵە چووبووین و مامۆستا شوکور بنووسێکی ئەدەبی و کۆمەڵایەتی و فەلسەفی و زانستانەی دانسقەیەو تەنها ئەوەی ئەوێ هەلی لەباری بۆ هەڵبکەوێ و بۆی بلوێ بکەوێتە سەر ڕێگاکەی و ئەوەیشی لە هەولێر لە سایەی حکومەتی هەرێمی کوردستان و چاودێریی تایبەتی بەڕێزان کاک مەسعود بارزانی و کاک نێچیرڤان بارزانی و

به پشتیوانی هەموو کۆڕ و کۆمەڵە سیاسی و ئەدەبی و ڕۆشنبیرییەکانی هەولێر، تا ڕادەیەکی چاوەڕوان نەکراو بۆ ڕەخسا.

لەبارەی تێکۆشانی میللەتی کوردی تورکیاوە کردوون بە عەرەبی، سەرچاوە گەلێکن لە زمانی عەرەبیدا، کەس تا ئێستا شتێکی ئەوتۆی بە عەرەبی لەبارەوە نەخوێندوونەتەوە. دیارە بە حوکمی ئەوەیش کە زۆربەی کوردی عێراق عەرەبیش ئەزانن ئەتوانری بەدڵنیایی یەوە بوترێ ئەمانە وەک خوێندەوارانی عەرەب زان، وەرگیراون. مەلا شوکور لەڕێگای کار کردنیەوە لە کۆڕی زانیاری کوردو پاشان لە دەستەی کوردی کۆڕی زانیاری عێراقدا و لەڕێگای کاریەوە لە گەلێ لە لیژنەکانی کۆڕو لە گۆڤارەکەی کۆڕو لە ئامادەکردنی کۆڕی دانانی ڕێگای ڕاستی نووسینی کوردییەوە خەفەتێکی فرەو فراوانی بەکولتووری کوردی کردووە بەشی هەر زۆری فەزلی ئەو زاراوە ئینسانی و زانستیانەی دەستەی کوردی کۆڕی زانیاری عێراق دایناون بۆ کاک شوکور ئەگەڕێتەوە.

لەبارەی ڕۆڵی ڕۆشنبیری مامۆستا مەلا شوکورەوە لە کوردستاندا ئەتوانی بڵێی چالاکییە ڕۆشنبیرییەکانی ئەو تێکرا هەردوو کوردستانی عێراق و ئێران و لەم ساڵانەی دوایشدا لەڕێگای نووسینی و وەرگێڕانییەوە بەعەرەبی گەیشتووەتە کوردستانی سوریایش. مامۆستا شوکور ئەگەر لە پێشی هەموو ئەوانەیشەوە نەبێت کە بە بەرهەمی کوردانی دەرەوەی کوردستانی عێراقیان ئاشنا کردووین، یەکێکە لە پێشینانی ئەوانە. ئەوبوو بە بەرهەکانی عەرەب شامیلۆن، سەمەندسیاندڤ، یەشار کەمال، ئەحمەد عارف، ئوردیخانی جەلیل و مەستوورەی کوردستانی ئاشنا کردین. ئەو بوو بە وەرگێڕانی کتێبە پر بەهاکەی ئەسکەندەر شەمی لە بایەخی شەرەفنامەی لە مێژووی گەلی کورددا ئاشنا کردین. یەکێک بوو لەوانەی بەرهەمی بنووسانی پێشکەوتنخوازی تورک نارم حیکمەت و ئیسماعیل بێشکچیان هی یەکەم بۆ کوردی و دووهەم بۆ عەرەبی وەرگێڕاوە. ئەوانە بوایەکی بەرهەمەکەی حسین عەلی شانۆڤی لەبارەی گۆرانی مەزنەوە لە ئازەرییەوە ئەکرد بە عەرەبی؟ ئەو بەرهەمانەی مامۆستا شوکور ئەدەبی و ڕۆشنبیرییەکانی هەولێر، تا ڕادەیەکی چاوەڕوان نەکراو، بۆ ڕەخسا.

مەرگی کاک شوکور زۆر لەپڕ بوو. کاک شوکور، چ لەبارەی توانای جەستەی و چ لەبارەی زانستی عەمار کراوی ناو دڵ و دەروونیەوە هێشتا زۆری بە بەرەوە مابوو. بابەتی تری وایش زۆر بوون پێویستیان بە کەسێکی وەک کاک شوکور هەبێ لە ئەستۆیان گرێ و جێ بەجێیان بکا. بۆیە کۆچی دوایی ناوادەی مامۆستا شوکور زیانێکی زل بوو لە کولتووری کورد کەوت و بەم نزیکانە کەسێکی وا هەڵناکەوێ بتوانێ لە هەموو ڕوویەکەوە جێی ئەو بگرێتەوە بە مەرگی مامۆستا شوکور کۆڵەکەیەکی ئەستووری بینای کۆڕی زانیاری کوردستان ڕووخا و زەرەرێکی قەرەبوو نەکراو لە زمانی کوردی کەوت.

ئێستایش کە کاک شوکورمان لەنێواندا نەماوە و جێگاکەی بەچۆڵی ئەبینین، هیوام وایە دوان لە ڕۆشنبیرانی بەتاقەتی هەولێر لەوانەی چاک شارەزای کاک شوکورن و باشی لێ حاڵی ئەبن ئەرکی بەسەر کردنەوەی هەموو دەفتەرو پارچە قاغەز و نووسراوە پاکنووس کراو و پاکنووس نەکراوەکانی لەئەستۆ بگرن و چیی هی بڵاوکردنەوە بێ ئامادەی بڵاوکردنەوەی بکەن.

هەروەها پێشنیازی ئەوەیش ئەکەم بنووس و ڕۆژنامەنووسێکی کارامەی مەلا شوکورناسی وەک برای ئازیزم کاک مەحمود زامداریش ئەرکی ئەوە لە ئەستۆ بگرێ کە دیدارێکی پان و درێژ و بەربڵاو لەگەڵ پەروین خانی هاوبەشی دەیان ساڵە ژیانی مامۆستا شوکور ساز بکاو پرسیاری زیرەکانە و توێژەرەوانەی وای لێبکا، هەموو سرەکانی ژیانی کاک شوکور، وەک ئەو ئاگای لێیە، ڕوون بکاتەوە. دوا پێشنیاریشم ئەوەیە کۆڕی زانیاریی کوردستان تا زووە کتێبخانەکەی کاک شوکور بکڕێت و بیباتە کۆڕ و لە شوێنێکی لەباری تایبەتیدا دایبنێ و بیخاتە بەر دەستی خوێندکاران و زانایان و توێژەرەوانی هەولێر تا هەموان سوودی لێ وەربگرین.

ئیتر سوپاسێکی زۆر بۆ بەرپاکەرانی ئەم کۆڕە قەشەنگەو، درووردی فرە بۆ گیانی خاوێنی مامۆستا شوکور مستەفاو، پرسەو سەرەخۆشیش لە هەموو گەلی کورد لە ڕۆشنبیرانی ئەم شارە ئازیزە و لە بنەماڵەو پاشماوەکانی مامۆستای کۆچکردوومان شوکور مستەفا دووبارە ئەکەمەوە.





# پێداچوونەوە و ڕاستکردنەوەی

# نادرنامەی ئەڵماس خانی کەڵهور

# چەند لە بیرچوونێکی مامۆستا شوکور مستەفا



کاروان عوسمان خەیات (ڕێبین)

لە مێژووی ئەدەبیاتی کوردیدا کەڵە شاعیرمان هەیە هەم شاعیر بووە و هەمیش کەسایەتییەکی سیاسی بووە. یان سەربازی ئەو ڕێگەیە بووە، یان ئەوەتا کایە سیاسییەکان وای لێکردووە ببێت بە شاعیر و شیعر بهۆنێتەوە، لەو ڕێگەیەشدا خزمەتی باشی بە مێژووی گەلی کورد و ئەدەبیاتەکەی کردووە.

نموونەشمان ئەمانەی لای خوارەوەیە: خانای قوبادی، ئەڵماس خانی کەنوولەیی، میرزا شەفیعی کولیایی، شێخ مەحمووی حەفید، مستەفا پاشای یامولکی... هتد.

ئەوەش ڕوون و ئاشکرایە مێژووی ئەدەبیاتی کوردی چەند لق و پۆپی لێدەبێتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا زمانی کوردی چەند شێوەزارێکی هەیە، لە هەمانکاتیشدا شاعیران و ئەدیبانی هەموو شێوەزارەکان کەڵە شاعیری دەگمەن و زیرەکیان لێهەڵکەوتووە، جگە لەوەش شاعیرانی هەر

قۆناغ و شێوەزارێکیش تایبەتمەندی و خاسێتی خۆیان هەبووە، ئەو شاعیرەیش بەرهەمەکانی دەبێ کەسانی شارەزا بەو بوارە و وردبوونەوە لە بەرهەم و قۆناغ و ژیانی کاری تێدا بکات.

ئەڵماس خانی کەنووڵەیش یەکێکە لەو شاعیرانەی کە بە شێوەزاری گۆرانی (ماچۆ) شیعری هۆنیوەتەوە، خاوەنی کۆمەڵێك داستان و بەرهەمی ناوازەیە، چ لە بواری وەرگێڕاندا، چ لە نامەی شیعری و شیعری گاڵتە و گەپ و داستانەکانی شانامە، هەر لەم بوارەدا خاوەنی چەندین بەرهەمە شیعرە کە تاکو ئێستا بە تەواوەتی کۆ نەکراوەتەوە و بڵاونەکراوەتەوە، ئەوەشی کە بڵاوکراوەتەوە، لە گۆڤار و ڕۆژنامە کۆنەکاندا بە پچڕ پچڕی و ناتەواوییەوە بڵاوکراوەتەوە.

لەم ساڵانەی دوایشدا مامۆستا شوکور موستەفا یەکێك لەو بەرهەمانەی ئەڵماس خانی لە قەوارەیەکی تایبەتیدا و لە دەزگای ئاراسدا بە چاپ گەیاند. ئەم بەرهەمەش لە لایەن مامۆستا حەمە ڕەشید ئەمینی پاوەیی و بەندەوە کاری تایپ و ڕێکخستنی بۆ کراوە، بەڵام ئەوەی جێگەی ئاماژەیە لێرەدا و پێویستییەکە دەبێ لە ئەمڕۆدا ئەم کتێبە بە لێکۆڵینەوە و بەشێوەیەکی ورد و بەراوردکاری و پەراوێزەوە کاری لەسەر بکرێت. ئەمەش لەلای مامۆستا شوکور مستەفا ڕەچاو نەکراوە. ئەوەی سەرنجی ڕاکێشام لێرەدا، پێداچوونەوەیەك بە کتێبەکەی مامۆستا شوکور مستەفا بکەم، ئەگەرچی ئەم کتێبە هەندێك ئەرکی منی سووك کردبووەوە، بەڵام لە هەمان کاتیشدا لەبەر ئەو هەڵە و لە بیرچوونەوانە کە لە کتێبەکەدا ڕوویداوە، بە پێویستم زانی لێرەدا بەپێی ئەو نووسخانەی بەردەستم و ئەوانەی کە تاکو ئێستا من دیومە، کۆنترین نووسخەی ساڵی (١٢٧٧) ی کۆچییە لەگەڵ ئەو نووسخە تازەیەی کە لە ساڵی (١٣٨٣) دا نووسراوەتەوە. ئەو لە بیرچوونانە بخەمە ڕوو. هەروەها هەندێ هەڵە و کەموکورتیش هەیە دەبێ ڕاست بکرێنەوە.

ئەگەرچی پێویست وابوو هەموو کتێبەکە بخوێنرێتەوە و بەراورد بکرێت، بەڵام لەبەر ئەوەی کاتی زۆری دەویست، بە باشم زانی تەنها چەند خاڵێك لەو هەڵە و لە بیرچوونانە دەستنیشان بکەم و ڕاستیان بکەمەوە... سەرەتا دەمەوێ لە ناوی کتێبەکەوە دەست پێبکەم، ئەم داستانە لەناو مێژووی ئەدەبیاتدا بەم ناوانەوە ناو دەبرێت:

١- نادرنامە.

٢- نادر و تۆپاڵ.

٣- داستانی نادرنامە.

٤- مەنزوومەی نادرشا «ناردنامە».

هەر یەك لەمانە هیچ هەڵە و کەموکورتیی و لە هەیبەت و ناوەڕۆکی داستانەکە کەم ناکاتەوە. بەڵام سەبارەت بە ناوی ئەڵماس خان لە سەر بەرگی کتێبەکە، ئەوا هەڵەیەکی گەورەی مێژوویی لەناو و ناونیشانی شاعیردا کراوە. چونکە لە مێژووی ئەدەبیاتی کوردیدا ئێمە تەنها دوو شاعیرمان بەناوی (ئەڵماس)ەوە هەیە. یەکیان «ئەڵماس خانی کەنوولەیی»یە، دووەمیان «خان ئەڵماس خان»ە.




شوکور مستەفا



بەم بۆنەوە دەمەوێ هەندێك لەو ژیاننامەیەی ئەڵماس خان کە لە ژمارە (٢٠٢)ی ڕاماندا بڵاوکراوەتەوە، لێرەدا بهێنمەوە بۆ ئەوەی بزانین ئێمە لە مێژووی ئەدەبیاتدا چەند شاعیرمان بەو ناوەوە هەیە.

«ناوی ئەڵماس خان:

ئەم شاعیرە لە سەرچاوەکاندا بە چەند شێوە و شێوازێك ناوی هاتووە، هەندێك لەو سەرچاوە چاپکراوانەی بەردەستی ئێمە کەوتوون و دەیانخەینە ڕوو، ڕای جیاوازیان لە سەر ناوی ئەڵماس خان هەیە، هەر بۆیە سەرەتا لە لای مامۆستا (سدیق بۆرەکەیی)یەوە دەست پێ دەکەین.

ئامادەکاری کتێبی (مێژووی وێژەی کوردی) لە سێ بەرگدا کە باسی ژیانی شاعیران و بەرهەم و شیعرەکانیان دەکات، لە بەرگی دووهەمی کتێبەکەیدا ناوی چەند شاعیرێك دەهێنێت بەناوی (ئەڵماس) ئامادەکار دەڵێت: «سێ شاعیرمان هەیە بە ناوی «خان ئەڵماسی لوڕستانی (١٠٧٢–١١٣٨) ئەڵماس خانی کەندۆڵەیی (١١١٨–١١٩١) ئەڵماس خانی کوردستانی (١١٦٥–١٢٢٧)».١

مامۆستا موحەممەد عەلی سوڵتانیش لە کتێبی حەدیقەی سوڵتانی– بەرگی یەکەمدا دەڵێت: (میرزا الماس خان– سرهنگ الماس خان– الماس خان کردستانی، که بهر سه عنوان اشتهار دارد از فرماندهان سپاه نادری بوده وتیب سنندج توسگ وی رهبری میشده است).٢

بابا مەردۆخیش دەڵێت: (سەرهەنگ ئەڵماس خان خەڵکی گوندی کەنووڵەی لای کرماشان)ە.٣

مامۆستا شوکور موستەفاش دەڵێت: (سەرهەنگ ئەڵماس خان خەڵکی کەنوولەی سەر بە گوندەکانی کرماشانە...).٤

ئەڵبەتە لە کۆی ناوی ئەو (ئەڵماس)انەی نووسەران و ڕووناکبیران هێناویانە، دەتوانین بەم شێوەیە ڕاستی بکەینەوە: شاعیری یەکەمیان کە ناوی (خان ئەڵماسی لوڕستانی)یە، ئەم شاعیرە لە شاعیرانی یارسانە و بە (خان ئەڵماس خانی لوڕستانی) ناوبانگی هەیە و زۆربەی هۆنراوەکانی لە شێوەی پەند و ئامۆژگاریدان، تاکو ئێستا چەند جارێك هۆنراوەکانی بە جیا و بەشێوازی لێکدانەوە بە ڕێنووسی کۆن و نوێ و شیکردنەوەی بە زمانی فارسی، شیعرەکانی چاپ کراون.

هەروەها شاعیری دووەم و سێهەم کە (ئەڵماس خانی کەندۆڵەیی) و (ئەڵماس خانی کوردستانی) و (سەرهەنگ ئەڵماس خان)ە، لە بنەڕەتدا هەرسێکیان یەك شاعیرن و مامۆستا سدیق بۆرەکەیی بە هەڵە کردوونی بە چەند شاعیری جیاواز، بەڵگەش بۆ قسەکانم ئەو نامە شیعرییە و هۆنراوانەیە کە لە نێوان (میرزا شەفیعی کولیایی) و (ئەڵماس خانی کەنووڵەیی) دا گۆڕدراونەتەوە و بوونیان هەیە، هەر خودی (ئەڵماس خان) کە بە (سەرهەنگ ئەڵماس خان) و بە (ئەڵماس خانی کەنووڵەیی) و (ئەڵماس خانی کوردستانی) ناسراوە، ئەگەر بەپێی قسەکانی مامۆستا بۆرەکەیی بێت، ئەوا نەك سێ شاعیرمان هەیە بە ناوی ئەڵماس، بگرە شەش شاعیرمان هەیە بە ناوی (ئەڵماس)ەوە، واتە: دەبێ بەم شێوە ناوی ئەڵماسەکان ڕیزبەند بکەین:

١– خان ئەڵماس خانی لوڕستانی.

٢– ئەڵماس خانی کەندۆڵەیی.

٣– ئەڵماس خانی کوردستانی.

٤– سەرهەنگ ئەڵماس خان.

٥– میرزا ئەڵماس خان.

٦– ئەڵماس خان کەڵهوڕ.

مامۆستا سوڵتانی لە هەمان سەرچاوەدا دیسانەوە دەڵێت: بە سێ شێوە ناو و ناوبانگی هەیە و ئەم سێ کەسەش هەر یەك شاعیرن، ئەو شاعیرەش میرزا (ئەڵماس خانی کەنووڵەیی)یە.

واتە: (ئەڵماس خانی کەندۆڵەیی «کەنوولە») و (ئەڵماس خانی کوردستانی) و (سەرهەنگ ئەڵماس خان)ە، لە بنەڕەتدا هەرسێکیان یەك شاعیرن، هەر ئەم شاعیرەشە کە ئێمە باسی دەکەین.

دەبێ بپرسین ئایا ئەمە ڕەوایە بەم شێوەیە ژیان و هۆنراوە و داستانەکانی شاعیرێك ببێت بە دوو شاعیری جیاواز و ژیان و بەرهەمەکانی تێك بدرێت؟!

له وەڵامی ئەم پرسیارەدا دەڵێین: لای هیچ کەس و لایەن و نەتەوە و وڵاتێك ڕەوا نییە بەرهەم و ژیانی شاعیرێك بدرێتە پاڵ کەسێك کە بوونی نییە، ئەگەر بوونیشی هەبێت، تاوانە، لە بنەڕەتیشدا ئەو کەسایەتیانە کە دروستکراون، یەك کەسن...»٥.

وەکو دەبینین مامۆستا شوکور مستەفا ناوی ئەڵماس خان بە ئەڵماس خانی کەڵهوڕ دەهێنێت، ئەمەش هەڵەیە، لە کۆی ئەو ناوانەی بۆ ئەڵماس خان دانراوە، وەکو : «ئەڵماس خانی کەندوڵەیی، ئەڵماس خانی کوردستانی، سەرهەنگ ئەڵماس خان» هەموو ئەمانە یەك کەسن و خاوەنی بەرهەمی نادرنامە و شیرین و خەسرەو و شانامە و داستانی مشك و پشیلە و دیوانە شیعری خۆیەتی....

کارێکی تر لەوانەی کە مامۆستا شوکور مستەفا کە دەبوو کاری لە سەر بکات، ساغکردنەوەی ژیانی ئەڵماس خان و بەرهەمەکانیەتی، لە ڕاستیدا مامۆستا ئەوەندە بە کورتی لە سەر ژیانی ئەڵماس خان کاری کردووە، وا دەچێت کە مامۆستا هیچ ماندوبوونێکی لەگەڵ ژیانی شاعیردا نەکێشابێت، یا بەدوویدا نەگەڕابێت، هەر ئەوەندە کە لە دوو لاپەڕەدا لایەك لە ژیانی شاعیر دەکاتەوە. جگە لەوەش هیچ هەڵسەنگاندن و بەدواداچوونی بۆ ساڵی لە دایکبوون و مردنی شاعیر نەنووسیوە. ئاخر لە ئەمڕۆکەدا کە ئەوان خاوەنی بیرێکی جوان و ڕێگایەکی زانستییان بە ئێمە نیشان دابێت، نازانم لەبەرچی و هۆکاری چی بووە کە بەڕێزیان ئەو کارەیان بەم شێوە لێکداوەتەوە؟! بێ ئەوەش هیچ ڕوونکردنەوەیەکیان لەو بارەوە بۆ ئێمە نەخستۆتە ڕوو.

هەروەها لە دووتوێی ئەو بەرهەمەدا چاوت بە پەراوێزێك ناکەوێت، یان چاوت بە سەرچاوەیەك ناکەوێت، ئەمەش جێگای گومانە و لە کاری زانستیدا ئەم جۆرە کارانە پەنجەی گومانیان لە سەر دادەنرێت.

لە سەرووی ئەمانەشەوە کە باسمان کردن، مامۆستا باسی ئەم داستانەی نەکردووە چۆن بووە و چۆن سەری هەڵداوە، هۆکاری نووسین و ماوەی نووسین و کەی نووسراوەتەوە، نادرشا لەم جەنگەدا چی کردووە، کێ بردوویەتییەوە، ساغ نەکردنەوەی دەستنووسەکە و نموونەی دەستنووسەکە، چەند نوسخەی دەستنووسەکەی لە بەردەستدا بووە... سەبارەت بە وردەکاری ساڵی نووسین و جەنگەکە لە بابەتێکدا باسم کردووە٦.

هەموو ئەمانە لەم کتێبەی نادرنامەدا ڕەچاو نەکراوە،





شوکور مستەفا

بەڵام خۆشبەختانە بەندە تاکو ئێستا ئاگاداری لە ٢٤ نووسخەی ئەم بەرهەمە هەیە. کۆن ترینیان کە بینومە، لە لای بەندەیە و ساغ کراوەتەوە و لەم کارەدا سوودی لێ بینراوە، دەبێ ئەوەش باس بکەم ٧ نووسخەی ئەم دەستنووسە کە هەموویان نووسخەی کۆنن، لەلام پارێزراون و بەراورد دەکرێنەوە. لەم سەروبەندەشدا هەڵەیەکی زۆر لە ڕێنووسی داستانەکەدا هەیە، مامۆستا باس لە وشەی (جە، لە، ژە) دەکات، کە ئەڵماس خان وشەی (ژە)ی بەکارهێناوە، کەچی مامۆستا لە چەند جێگەدا لە بری (ژە) نووسیویەتی (ژ)... بنواڕە لاپەڕە (٥٧، ١٠٤، ١٠٥، ١٠٦...).

گورێزان وە جەخت کەردشان فیرار

ت ملك تووران تاریان و تار (لا: ٨٣)

لە نووسخەکەی ساڵی (١٢٧٧) دا بەیتەکە بەم شێوەیە:

گورێزان وە جەخت، کەردشان فەرار

تا موڵك تووران، تاریان وە تار

لە جێگەیەکی تریدا نووسیویەتی:

خشت کەمارە ج خێڵ خەرساوی

ئەیلام تەتەر لار و لیراوی (لا: ٨٦)

لە نووسخەکەدا بەم شێوەیە نووسراوە:

خشت کەمارەج، ئەهل (خورساوی)

ئیسلامی نەزەر، لاری و لێراوی

خاڵێکی تر کە دەبێ قسەی لە سەر بکرێت و فەرامۆش نەکرێت، خاڵبەندییە لە شیعرەکەدا، لە ڕاستیدا مامۆستا زۆر بە کەمی لە شیعرەکاندا لای لە خاڵبەندیی کردووەتەوە. ئەمەش لە داستانە شیعردا خاڵی سەرەکی و جێی بایەخە، چونکە داستان وەکو شیعرێکی هەشت و نۆ بەیتی و ١٠ بەیتی نییە، ئەو جۆرە شیعرانە پێویستیان بە هەناسەی زۆر درێژ نییە، بەڵام لە داستانە شیعر و ئەم جۆرە شیعرانەدا خوێنەر پێویستی بە هەناسەی درێژ هەیە، خاڵبەندییش ئەو جۆرە پشوو و هەناسانەی دیاری کردووە و وا لە مرۆڤ دەکات کە ماندوو نەبێت.

سەبارەت بە بیر چوونەوەکان:

لەم داستانەدا کە مامۆستا شوکور مستەفا ڕێنووسی کردووە و بڵاوی کردووەتەوە، بەندە هەموو بەیتەکانی جووت کردووەتەوە، بەڵام لەبەر ئەوەی لەگەڵ نووسخەکەی بەردەستمان دا بەراورد نەکراوە بزانین چەند جووت بەیتی لەبیرچووە، بەڵام ئەوەندە هەیە کە بەپێی دیاری کردن و جووت بەیتکردن.

.................................

لێرەدا بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە چەند نیوە بەیت لە بیرکراوە، ئەمەش وا دەردەکەوێت کە نە کاکی تایپێست و نە مامۆستا شوکور مستەفاش پێداچوونەوەیان بە کتێبەکە و جووت بەیتەکاندا نەگێڕاوە. لەبەر ئەوەی نووسخەکەی ساڵی (١٢٧٧) چەند پەڕەیەکی سەرەتای فەوتاوە، نووسخەی دووەم لە سەرەتاوە بەکار دەهێنین. جێگای سەرسوڕمانە هەر لە یەکەم لاپەڕەی داستانەکەدا پێنجەم بەیت نیوە بەیتێکی نەهاتووە، کە ئەمەی لای خوارەوەیە:



نەجای نەجات بەخش حاتەمان تەی

................. (لا: ١٧)

ئەو نیوە بەیتەی کە نوختەمان لە جێگەی داناوە و لە چاپکراوەکەدا نەهاتووە. بەڵام نیوە بەیتی دووەمی لە دەستنووسێکی ساڵی (٢٢-٤-١٣٨٣) دا بەم شێوە هاتووە:

سەخای سەخابەخش، هاتەمان تەی

کەریك کاووس، کەیومەرس کەی

دیسانەوە بەیتێکی تری کە مامۆستا نیوە بەیتێکی لە بیر چووە:

خونکار غەزەبناك خرۆشا نە سەر

..................... (لا: ٣٤)

لە دەستنووسی ساڵی (١٣٨٣) دا بەم شێوە هاتووە:

خونکار غەزەبناك، خرۆشا وە شەڕ

فەرما سەرکەشان جمنان لەشکەر

لە جێگەیەکی تریدا مامۆستا بەیتێکی تری بەم شێوەیە ڕێنووس دەکات:

جەبر جودایی هەڵاڵ هامسەر

گیریا کەیوان بە نای شەوق خۆر؟ (لا: ٣٦)

لە دەستنووسەکەدا بەم شێوە هاتووە، دەستنووسی ساڵی (١٣٨٣):

جەبر جودایی، حەڵاڵ هامسەر

گیریا کەیوان، شەفاف شەوق خوەر

لە دەستنووسی ساڵی (١٢٧٧) دا بەم شێوە هاتووە:

جەبر جودایی، حەڵاڵ و هامسەر

گێزنان کێوان، پەنهای شەوق خوەر

لە شونێکی تردا دوو بەیت بە دوای یەکدا هەر یەکەیان نیوە بەیتێکی لە بیر کراوە:

وەلحاصڵ ئەفغان وە شوورشت جەنگ

هۆرگێڵان ژە ڕەزم حەربەی تەخت تاج... (لا: ٥٢)

دەستنووسی ساڵی (١٢٧٧):

وەلحاسڵ ئەفغان وە شۆڕشت جەنگ

ڕۆمی ڕواڵان، فەرسەنگ وە فەرسەنگ

هۆرگێڵان ژە ڕەزم، حەربەی تەخت و تاج

بەبران بەنا کەرد، وە تەخت و تاراج

دەستنووسی ساڵی (١٣٨٣):

وەلحاسڵ ئەوغان وە شۆڕشت جەنگ

ڕۆمی ڕواڵان، فەرسەنگ وە فەرسەنگ

هۆرگێڵان وە ڕەزم، حەربەی تەخت تاج

بەوران بەنا کەرد، وە تەخت تاراج

لە لاپەڕەی دواتردا مامۆستا دیسانەوە نیوە بەیتێکی لە بیر چووە:

............................

ئاوەردن سەران چەند کەڵلە مەنار (لا: ٥٣)

دەستنووسی ساڵی (١٢٧٧):

ئاوەردەن سەران، سەرهەنگ وە خەروار

تەمام کەردشان وە کەڵلەی مەنار

شوکور مستەفا:

سان دا وە سپا ڕاهی کەرد ئەسکەر

.................. (لا: ٥٤)





دەستنووسی ساڵی (١٢٧٧):

سان دا سەف ئارای سەر سان لەشكەر

(ئەحمەد پادشا)ی ڕۆم كەرد وە سەر عەسكەر

دەستنووسی ساڵی (١٣٨٣):

سان دا وە سوپا، ڕاهی كەرد لەشكەر

(ئەحمەد پادشا)ی ڕۆم كەرد وە سەر عەسكەر

شوكور مستەفا:

نیشانەی نەبەرد مەردی وە هەیبەت

............................

نەزم ناموەر زوور زەبر دەست

نەزم ناموەر زوور زەبر دەست

داوەی دەست برد تەخش تیر شەصت

......................... (لا: ٥٨)

دەستنووسی ساڵی (١٢٧٧):

نیشانەی نەبەرد مەردی وە هەیبەت

شوجاعی لیقای توندی وە تەیبەت

نەزمی ناموەر، زۆر زەبر دەست

داوی دەست و برد، تەخش تیر نە شەست

شوكور مستەفا:

ژە ملك مەشهەد پەنجەی مەعجەز بەر

ژە ئاب حەیات نەهەنگ نگوون كەرد(لا: ٥٩)

دەستنووسی ساڵی (١٢٧٧):

ژە موڵك مەشهەد، پەنجە بەرۆن بەر

ژە ئاب (عوممان)، نەهەنگ نگوون كەر

دەستنووسی ساڵی (١٣٨٣):

نە موڵك مەشهەد، پەنجە منجەر بەر

نە ئاب عوممان، نەهەنگ بێروون كەر

شوكور مستەفا:

چوینكە تەنگش بی خان خاترڕێش

سالاری سپاه بەخشا پێش

سپاهسالاری بەخشا پێش

..................

حوكم سەرداری بەخشا وە نادر

نە فەرمانش دا كەس نەبۆ قادر(لا: ٦٥)

لێرەدا دەبینین مامۆستا نیوە بەیتێكی دووجار نووسیوە، ئەمەش وای كردووە كە خوێنەر هەست بكات كە نیوە بەیتێك بە نوقسانی هاتووە.

دەستنووسی ساڵی (١٢٧٧):

چونكە تەنگش بی خان خاتر ڕێش

سوپا سالاری، سوپا بەخشا پێش

حوكم سەرداری بەخشا وە نادر

نەفەرمانش دا، كەس نەبۆ قادر

دەستنووسی ساڵی (١٣٨٣):

چونكە تەنگش بی خان خاتر ڕێش

سوپا سالاری بەخشا وە پێش

حوكم سەرداری بەخشا وە نادر

نەفەرمانش بۆ، كەس نەبۆ قادر

شوكور مستەفا:

قورتمان فیل جەنگی بێ درێغ

................... (لا: ٩٣)

دەستنووسی ساڵی (١٢٧٧):

خوڕتومان فیل، جەنگی بێ درێغ

بەند كەردەن پەیوەست، وە ئەڵماس تێغ

دەستنووسی ساڵی (١٣٨٣):

خوڕتومان فیل، جەنگ بێ درێغ

بەند كەردەن پەیوەست، وە ئەڵماس تێغ

شوكور مستەفا:

ناڵەی كەڕەنا گرمەی تەپڵ كۆس

.................. (لا: ٩٣)

دەستنووسی ساڵی (١٢٧٧):

ناڵەی كەڕەنا، گرمەی تەپڵ كووس

جیڕەی عەرابان، فیل مەنگەلووس

دەستنووسی ساڵی (١٣٨٣):

ناڵەی كەڕەنا، گرمەی تەپڵ كووس

زیڕەی عەرابان، فیل مەنگەلووس

شوكور مستەفا:

مەیۆم ئینتیقام وێرانی ئێران

.................. (لا: ١٠٢)

دەستنووسی ساڵی (١٢٧٧):
مەبۆ ئینتیقام، وێرانی ئێران
چەنەت بستانۆ، چوون نەرە شێران
دەستنووسی ساڵی (١٣٨٣):
مەبۆ ئینتیقام، وێرانی ئێران
چەنەت بستانۆن، وە شۆڕِ شێران
شوکور مستەفا:
زەڵەی زەلالەت فەریاد ئەفغان
دارایی داران خاصەکی خاصان
خاصە کەنیزان والاّ لیباسان
سادە ساقیان خواجە غولاّمان
مەلەك مەحبووبان کۆی زانو نەدامەت
.......................... (لا: ١٠٧)
دەستنووسی ساڵی (١٢٧٧):
زەلە و زەلالەت، فەریاد و فیغان
خێزا ژە حەرەم، سالار ئەفغان
دارایی داران، خاسەگی خاسان
خاسەی کەنیزان، والاّ لیباسان
سادە ساقیان، خواجە غولاّمان
مەلەك مەحبووبان، کۆی زوڵف نەدامان
دەستنووسی ساڵی (١٣٨٣):
زەلە زەلالەت، فەریاد فیغان
خێزا وە حەرەم، سالار ئەوغان
نازك نازداران، خاسەکی خاسان
خاسە کەنیزان، کۆی زوڵف نەدامان
شوکور مستەفا:
بیان ئەو نەبەرد شوور شێرانەنەوە
داو قەصاصان، تەخت توورانەن
ئاشووب عەزیم شوور ئەکبەرەن
جەنگ غولغولەی قەهر قەیسەرەن
ژە خیشم خەزای خەیبەر، بەتەرەن
داوی داوییان تیپ تەتەرەن
هەر کەس نام نەنگ مەردیش وە ویرەن
مەردی ئارۆن ئیمجار وە گیرەن (لا: ١١٤)

دەستنووسی ساڵی (١٢٧٧):
بیان ئەو نەبەرد، شۆڕِ شێرانەن
داو قەساسان، سەخت توورانەن
ئاشووب عەزیم، شۆڕِ ئاگرەن
جەنگ غولغوولەی، قەهر قەیسەرەن
چە خەشم غەزای خەیبەر، بەتەرەن
دەعوای داویان، تیپ (تەتەر)ەن
هەر کەس نام نەنگ، مەردیش وە ویرەن
مەردی ئارۆوەن، ئیمجار وە گیرەن
دەستنووسی ساڵی (١٣٨٣):
ئەم چەند بەیتە لەم نووسخەیەدا پێش چاوم نەکەوت.
شوکور مستەفا:
جۆشیان وە جەهد خرۆش خانان
ئامان وە هەمدا هەی داد هەیەن
جاڕدان وە هەمدا، هەی جاڕش هەیەن
جاڕ ناموسەن مەردی پەی کەیەن (لا: ١١٤)
دەستنووسی ساڵی (١٢٧٧):
جۆشیان وە جەهد، خرۆش خانان
ئامان وە هەمدا، سان سوڵتانان
جاڕدان وە هەمدا، هەی جاڕش هەیەن
جاڕ ناموسەن، مەردی پەی کەیەن
دەستنووسی ساڵی (١٣٨٣):
جۆشیان وە جەهد، خرۆش خانان
ئامان وە هەمدا، سان سوڵتانان
سەهەند داران، جەهد جەنگی دان
سان سەف ئارای سوپای سەنگی دان
شوکور مستەفا:
چوین تۆف تۆفان قەهر غەزە بناك
چوین تۆف تۆفان قەهر غەزەبناك
تەوق تەنتەنەی تووران کەرد وە خاك (لا: ١٢٢)
وەکو دەبینین مامۆستا لێرەشدا نیوە بەیتێکی دووجار هێناوە و خوێنەر وا هەست دەکات کە نیوە بەیتێك لە بیرکراوە.
دەستنووسی ساڵی (١٢٧٧):





چوون تۆف تۆفان، قەهر غەزەب ناك

تەوق تەنتەنەی تووران، کەرد وە خاك

دەستنووسی ساڵی (١٣٨٣):

چوون تۆف تۆفان، قەهر غەزەب ناك

تەوق تەنتەنەی تووران، کەرد وە خاك

شوکور مستەفا:

تەوق تەنتەنەی تووران کەرد وە خاك

.......................... (لا: ١٢٣)

دەستنووسی ساڵی (١٢٧٧):

چوون تۆف تۆفان، قەهر غەزەب ناك

تەوق تەنتەنەی تووران، کەرد وە خاك

دەستنووسی ساڵی (١٣٨٣):

لەم نووسخەیاندا ئەم بەیتە نەهاتووە.

شوکور مستەفا:

نادر وات تۆپاڵ مەدەر گیز گاز

یە جای جەنگەن نیەن جای گوزاف (لا: ١٤١)

دەستنووسی ساڵی (١٢٧٧):

نادر وات: تۆپاڵ مەدەر گیز و گاف؟

یە جەهد جەنگەن، نییەن جای گەزاف؟

دەستنووسی ساڵی (١٣٨٣):

نادر وات: تۆپاڵ مەدەر گیف و گاف؟

یە جەهد جەنگەن، نییەن جای گەزاف؟

شوکور مستەفا:

مەر ژە بازیچەی بازاڕ ئەفسوون

فرصەت ژە گێج گەردوون بیایی (لا: ١٤١)

ئـەم بەیتە لـەلای مامۆستا شـوکـور مستەفا وا دەردەکەوێت کە هـەردوو نیوە بەیتەکە هەر یەکی نیوە بەیتێکیان نوقسان بێت، بـەڵام لە ڕاستیدا بەیتەکە تێکچووە، ئەمەش بەیتەکەیە لە نوسخەکەی بەردەستی ئێمەدا.

دەستنووسی ساڵی (١٢٧٧):

مەر ژە بازیچەی پڕ، مەکر و ئەفسوون

بیا بێ فرسەت، ژە گێج گەردوون

شوکور مستەفا:

تەڕاقەی تەوززین ترووق ئەسپەو

............................

تاسی تەل تووین حەربەی شوور شەڕ

............................

قاژەی تۆف تۆپ جۆش جەزایر

گەردەلویل تۆزنە بەرز بایر(لا: ١٤٥)

دەستنووسی ساڵی (١٢٧٧):

تراقەی تۆپەری شۆڕشت تێش بەر

تاس تل تەوێن، حەربەی کارگەر

تەقەی تەبەرزین، حەربەی شۆڕ شەڕ

خوود خار شکەن، سپەر تا وە سەر

قاژەی تۆف تۆپ، جۆش جەزایر

گرگەی تەویڵ تەرز، ژە بەرزە بایر

دەستنووسی ساڵی (١٣٨٣):

تراقەی تۆپز شۆڕشت شەش پەڕ

تاس تل تەوێن، حەربەی شۆڕ شەڕ

وە زەبـــر زەرب



١٣٨

ای ابری دخت هفت سال سرتمام    دخت خاقان در نشور در نعام

کون منوچهر پادشاه ایران    کون کیقباد و گرشاسب چنی نریمان

سهراب دلیر بزور زور چنگ    کون فرامرز و کوچی ببر نک

گیو الف جم رهام و بهرام    کون زواره دلیر نیک نام

رستم دلیر کله دیو    نر    کون جهانگیر و بینه شیر نر

نه دمای اوان داوی دلیران    ندیم چون نادر و ملک ایران

توانود مشق قلای قندهار    هندوستان و تور کردش اختصار

ای داستانه وی جابی تمام    بین و تاریخ تا دور ایام

ای داستانه وی جابی تمام    هرکس بخوانود نیاش بود و کام

پایان دام کتاو شازاده نادر    بمانیی و شادای جمه حاضر

نوی سنده کتاو میرزا اسدالله    ختم کرد کتاو و یاری الله

خاتم داستان نادرشاه و توپال و اشرف افغان

وخونکار رومی در تاریخ بیست دوم تیرماه سال

یک هزار و سیصد و هشتاد و سه شمسی

به خط و قلم اسدالله صفری منطقه گوران

١٣٨٣/٤/٢٢

اسداله صفری

* بۆ خۆی ڕۆژنامەنووسی بە مانا سیاسەکەی دەسەڵاتی چوارەمە. لە ڕووی سیاسیەوە ڕۆڵێکی گەورە دەبینێ. ئەگەر ئامانجی ڕۆژنامەنووسیش گەیاندنی حەقیقەت بێ بە هەموو ئینسانێک لە ئاستێکی ئاسان و سانا و بێ گرێ و گۆڵدا، بێگومان ئەوکاتە ڕۆژنامەنووسی ڕۆڵی خۆی دەبینێ. بەڵام سەبارەت بەوەی کە ئایا لە کوردستاندا ڕۆژنامەنووسی گەیشتۆتە ئەو ئاستەی کە لێی چاوەڕێ دەکرێ، ئەوا من پێموایە ڕۆژنامەنووسی یان هەر شتێکی دیکەی شارستانیانەی ئەم سەردەمە لە کوردستاندا لە بنەڕەتدا بەباری سیاسی میللەتەکەمان، ژیان و گوزەرانی خەڵکی کوردستان و سەرکردایەتی میللەتی کوردەوە بەستراوەتەوە.

ئەگەر بکرابایە بە قووڵیی باست لەو مەدارە فرەوانەی کە لە کوردستاندا ڕۆژنامەنووسی بە ژیانی خەڵک و ئاستی فەرهەنگ و ڕۆڵی سەرکردایەتیەوە بەستۆتەوە. بکردبایە.

* من ئەوانە هەمووی بۆ خۆی وەکو تابلۆیەک دەبینم کە ئەم تابلۆیە هەمووی پەیوەندییان بەیەکەوە هەیە، هەریەکەیان کاریگەرییەکی بەسەر ئەوەی دیکەیانەوە هەیە. بەتایبەت سەرکردەی سیاسی کە دەبێ لەم قۆناغەی ئێستادا زۆر زیرەک و چاپوک و بەکار بێت. ئەو سەرکردایەتیە ئەگەر توانی خۆی بگەیەنێتە هەموو ماڵێک و هەموو کەسێک و لە نزیکەوە هەوڵی ئاگاداربوون لە گیروگرفتی خەڵکی دا. ئەوانە ئەودەم پێموایە ئەم سەرکردایەتیە زۆر چاک دەچێتە نێو دڵی میللەتەوە و ڕادەی جەماوەرییەتی زیاد دەکات.

**لە دواکەوتوویی ڕۆژنامەنووسیی کوردیی لە کوردستاندا تا چەند سەرکردایەتی سیاسی لە کوردستان بە بەرپرسیار دەزانی؟**

* ڕەنگە زۆری بخەمە ئەستۆی سەرکردایەتی

بۆ

شوکور مستەفا



* ڕەنگە سەرکردایەتی لەزۆر ڕووەوە، پێویستییەکانی کاری ڕۆژنامەنووسیی دابین بکات، بەڵام ئایا سەرکردایەتی بۆخۆی دوای ڕەنگدانەوەی کارەکانی دەکەوێ. دوای ئەوە ئایا بەرنامەی سیاسی سەرکردایەتی لە شتە زۆر گرنگەکاندا ڕەنگ دەداتەوە و ئایا هیچ حەق و حیسابێک هەیە؟ دەبێ سەرکردایەتی سیاسی پرۆگرامێکی هەبێ بۆ ئەوەی لە خەڵک بگەیەنێت کە کوردایەتی ئەم قۆناغە چۆنە و پێویستە خەڵک چۆن کوردایەتی بکات.

**واتا پێت وایە دەسەڵاتی سیاسی، لە پێدانی ئازادی و بوونی ئازادی کە بەشێکی زۆر گەورەیە لە کاری ڕۆژنامەنووسیدا، کەم و کورتی هەیە یان کەمی داوە یان هەر نەیداوە؟**

* من پێموایە ئازادییەکی زۆری داوە، بەڵام دەبێ لێپرسینەوەی هەبێ، چونکە ئازادی ئەوە نییە من و تۆ بە ئارەزووی خۆمان چیمان ویست بیڵێین و چیمان ویست بیکەین. ئازادی واتا ئەنجامدانی ئەوکارانەی کە پێویستە ئەنجام بدرێن.

بەس ئەمرۆ لە دنیادا دەڵێن ڕۆژنامەنووسی بە هەموو بوارەکانی – ڕاگەیاندن – جاری وا هەیە دەسەڵاتی سیاسی ناچار دەکات لەسەر ڕێبازێک بڕوات، یان جاری وا هەیە ڕاگەیاندن وادەکات هەندێ لە دەوڵەتەکان هەڵوێستی نوێ لە مەڕ شتێک وەربگرن و زۆر جاریش هەڵوێستی مرۆیی. هەروەها ڕایەک هەیە کە ڕاگەیاندنی ئەمرۆی دنیا بەشێوەی گشتی لە وروژاندنی بابەتەکاندا بە سەهوو ناچێ. کەواتە لەمرۆی دنیادا هیچ سنورێک بۆ ئازادی ڕۆژنامەنووسی ڕەوا نییە، بە پێچەوانەی ئەو قسەی کەوا ڕاگەیاندن تەعبیر لە ڕای دەوڵەتێک بکات.

ئازادی شتێکە کە لە هەموو قۆناغێک و بوارێکدا پێویستە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەبێ پەرژینێکی هەبێت. دەبێ کەسێک هەبێ کە بزانێ ئەو ئازادییە چۆن بەکار دێت. هەروەها دەبێ خەڵک فێر بکرێ چۆن ئازادی بەکار بهێنێ،



چونکە هێشتا ئێمە فێر نەبوین ئازادی بەکار بهێنین و لە زۆر بواردا گرفتمان هەیە.

**بەشی دووەمی پرسیارەکەم ئەوە بوو، ئایا لە کوردستاندا هەست بە بوونی رۆژنامەنووس – بە مەفهومی رۆژنامەنووس – دەکەی؟**

* ئەگەر مەسەلەکە لە چاو رۆژنامەنووسیی ئەورووپا و غەیری خۆماندا لێک بدەینەوە، بارودۆخی رۆژنامەنووسیی و بوونی رۆژنامەنووس لە کوردستاندا، وەکو تروسکەی ئاگری جگەرەیەک لە تاریکە شەوێکدا دەبینم.

**تۆ باست لەوە کرد، کە لەسەرەتای دەستپێکردنی کاری رۆژنامەنووسیدا، بەدرخانییەکان گرفتی زمانیان هەبووە و لەبەر نەبوونی زمانی کوردی پەنایان بردۆتە بەر تورکی. بە درێژایی ئەم (١٠٠) ساڵە گرفتی زمان لە کۆڵ رۆژنامەنووس و کاری رۆژنامەنووسی لە کوردستان نەبۆتەوە و کارێکی زۆری کردۆتە سەر ئەم ڕەوشە. جەنابت هەوڵتداوە کەوا شتەکان بە لەهجەیەك بنووسی زۆربەی خەڵکی لێی تێبگەن. لە هەمان کاتدا شان بە شانی ئێوە کەسانێکی وەکو هەژاری موکریانی، کارێکی زۆر گەورەیان لە زمانی رۆژنامەنووسیدا کردەوە و شانازییەکی گەورە بۆ هەژاری موکریانی بەجێما کەوا لە دوای خۆی چگە لە بەرهەمەکانی، فەرهەنگێکی کوردیی زۆر گەورەشی بەجێ هێشتووە. زمان لە رۆژنامەنووسیی ئەمرۆی کوردیدا چەند گرفت یان کەرەستەیەکی لەبارە، ئایا رۆژنامەنووس و رۆشنبیر ئازاد نادات؟**

زمان نەک هەر زمانی رۆژنامەنووسییە، بگرە زمان، زمانی ژیان، زمانی جوتیار، زمانی کرێکار، زمانی ئەفەندی و زمانی هەموو مرۆڤێکە و هەر کەسە بەشی خۆی لێوەرگرتووە. بەڵام ئەگەر بتەوێ زۆری تەسک کەیتەوە، ئەوا رەنگە لە رۆژنامەنووسیدا برێ زاراوە و شتی وا بەکار بێت کە لە مەیدانێکی دیکەدا بەکار نەیەت. بە گشتی من پێموایە زمانی کوردی چ بەشێوەی کرمانجی سەروو و چ بەشێوەی کرمانجی خواروو، لەم (٥٠) ساڵەی دواییدا شان بەشانی یەکدی زۆر پێشکەوتوون.

باسی هەژاری خوالێخۆشبووت کرد، بەڕاستی هەژار رۆڵێکی زۆر گەورەی لە پالاوتنی زمانی کوردیدا هەبووە. بەتایبەتی شێوەزاری موکریانی کە شاعیرە کلاسیکییە گەورەکانمان لە بابەتی نالی و سالم و ئەوانە هەموو بەو شێوە موکریانە شیعریان گوتووە. هەژاری موکریانیش هەر پەیڕەوی ئەم رێگەیەی کردووە. من بۆ خۆم ئەم زمانەم زۆر پێخۆشە و هەر بەو بارەشدا شتم نووسیوە. بە گشتی لە کوردستانی عێراقدا زمانی کوردی لە زۆر بوارە مرۆییەکاندا، لە فیزیا و کیمیا و ئەوەی پێی دەڵێن بوارە زانستیەکان، هێشتا ماویەتی. ئەمەش هەر ئێمەی نەگرتۆتەوە. تورک و فارس و عەرەبیش هێشتا لە زۆر شتدا لۆقە دەکەن و لە دوای ئەورووپاوەن. دیارە ئەوەش خەتای ئێمە نییە و مێژوو وای لێکردوین کە دوا بکەوین و نەتوانین لەو مەیدانانەدا، وەکو ئەوان پێش بکەوین. من زۆر خۆشبەختم کە بتوانم لە زۆر شتدا بە کوردی بیر و ڕاکانی خۆم دەربڕم.

**مامۆستا دوای ڕاپەڕین، قۆناغێکی نوێ لە ژیانی میللەتی کورد لە هەموو بوارەکاندا دەستی پێکردوە. لە بواری فەرهەنگ و رۆژنامەنووسیشدا قۆناغێك بوو کە دەبوایە پتر لە هەموو بوارەکانی دیکە ئەو نوێیایەتییەی پێوە دیار بێ، چونکە بە درێژایی کاری رۆژنامەنووسی لە کوردستاندا، نەبوونی ئازادی ئاستەنگێکی یەکجار زۆر گەورە بووە لە بەرامبەر داهێناندا. کەچی بە پێچەوانەوە دوای ڕاپەڕین لە کوردستاندا، داهێنان کەم بوەوە و چالاکی سەرهەڵدانی رۆشنبیری، بە مەفهومی ئەوەی کەوا دەبوایە پەل بۆ بەشێك لەو ئێش و ئازارە مێژووییانەش باوێ کە نەیتوانیوە لە سەردەمی دیکتاتۆریدا چارەسەریان بکات، بەڵام بە پێچەوانەوە لەو شەش ساڵەی یەکەمی دوای ڕاپەرین، جۆرێ لە کوژانەوە و پاشەکشێ ڕوویداوە و هەندێ کەس پێیان وایە کە رۆشنبیرانی کورد نەیانتوانی لەگەڵ ئازادیدا برۆن. جەنابت ئەم دیاردەیە چۆن هەڵدەسەنگێنی؟**

* هەست دەکەم ئەوە شتێکی سروشتییە، کاتێک سیاسەت هەموو دنیا دادەگرێ دەبێتە شتێک کە وەکو نان و ئاوی لێدێت، لە هەموو مەیدانێکدا خۆی دەسەپێنێ. ئەو دەم بوارەکانی دیکە دەکشێنەوە، کابرا حزبییەو دەیەوێ باسی حزب بکات، ئەوەی دیکەیان دەیەوێ باسی رێکخستن بکات ئەوانەش وەنەبێت لوغەتێکی تایبەتیان هەبێت، چونکە سیاسەتیش لوغەتی خۆی هەیە. سیاسیەت لوغەتێکی خێراو کەم تەمەنی هەیە و لە دوای خۆی هیچ بەجێ ناهێڵێ. واتا

شتێکی وەکو شیعر، یان چیرۆکێک، یان داستانێک، درووست ناکات، شتێکە دەگوترێ و ڕۆژانە خەڵک دەیبیستن و دوایی لە بیریان دەچێتەوە. کاتێ سیاسەت دەبێ بە ئاغا، ڕۆشنبیر دەنگی کپ دەبێت. ئەوەش وەنەبێ تەنها لە مێژووی ئێمەدا ڕوویدابێ. زۆرینەی نەتەوەکان ئەو حاڵەتەیان دیوە. بۆ نموونە، کاتێ ئەمەوییەکان هاتنە سەرکار، قۆناغی فراوانخوازی و دنیا گیریی عەرەبەکان نەوەستا. بەم پێیەش هەموو شتێ مەفهومی سیاسی وەرگرت. تەنانەت شیعریش لەم بازنەیەدا بوو. بە پێچەوانەوە کاتێک کە عەباسیەکان دێن سیاسەت تۆزێک کپ دەبێت. تەمەشا دەکەی لەسەردەمی مەئموندا فەرهەنگ و شارستانیەت گەیشتۆتە چڵەپۆپە. ئەمەش ئەوە دەردەخات کە لەم سەردەمانەدا ڕۆشنبیریی پتر هەناسە دەدات. لەسەردەمی عەباسیەکاندا دەوڵەت فراوانیی بەخۆیەوە دیت و سەقامگیر بوو. بەم پێیە دەردەکەوێ کە سەقامگیری ڕۆڵێکی بەرچاوی لە پێشکەوتندا هەیەو بە پێچەوانەوە باری فەرهەنگی لە ناسەقامگیریدا لە پلەی دووەم و سێیەمدا.

**زۆر لەوانەی کە ئێستا خۆی بە مێژووی فەرهەنگ و ڕۆژنامەنووسی کوردییەوە خەریك دەکەن، پێیانوایە بە گشتی، بە خشینی ڕۆشنبیرانی کورد زۆر کەمەو کەمتر ڕۆشنبیری کورد لە گرفت و بوونی خۆی ورد دەبێتەوە و کەمتر بە ناخی خۆیدا دەچێتە خوارەوە. هەر بۆیەش لە ڕۆشنبیرانی دراوسێی ئێمەدا کەسانی وەك ئیسماعیل بێشکچی و زۆری دیکە هەن کەوا هەندێ کەس پێیانوایە لە خاوەن بیر و ڕۆشنبیرانی کورد پتر هەوڵیان داوە لە کۆمەڵی کوردەواری بگەن و ڕێوشوێنی بۆ دابنێن. ئەم دیاردەیە جۆرێکە لە لەخۆبێگانە بوون و سپاردنی مەسەلە ڕۆشنبیریەکان بە ڕۆشنبیرانی بیانی. بە ڕای جەنابت ئەم دیاردەیەی ناو ڕۆشنبیری کورد لە چییەوە دێ؟**

* جارێ ئێمە پێش ئەوەی قوتابخانەی عەرەبیمان بۆ بکەنەوە و بەعەرەبی بخوێنین، لە سەردەمی عوسمانیدا کە لەکوردستانی عێراق و تورکیا و لە هەموو کوردستاندا قوتابخانەی ڕەسمی نەبووە و نە بەتورکی و نەبە عەرەبی و نەبە فارسی نەمان خوێندووە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا حوجرەی مەلاو فەقێیایەتی هەبووە، حوجرەی مەلا و فەقێ، مەلای چاکی بۆ ئەو قۆناغە سیاسیەی کە کورد تێدا ژیاوە پەروەردە کردووە. بەڵام بۆچی ئەوانە مەلای چاك بوونەو لەبەرچی نێویان هەیە؟ لە پێش هەموو شتێکدا ئەم مەلایانە دوو شت فێربوونە؛ سەرەتا لە کەلەپوری میللەتەکەی خۆیان گەیشتوون و زانیویانە کورد فۆلکلۆری هەیە، فۆلکلۆریش زۆر شتە و بەم پێیە بە تەواوەتی چونەتە نێو میللەتەکەیانەوە، واتا ئاگایان لە میللەتەکەی خۆین بووە، تێگەیشتوون ئەوجا زۆر لە ئەدەبی فارسی نزیک کەوتوونەتەوە.

**پێت وایە ئەمانە توانیبیان کاریگەری لە فەرهەنگی کورد بکەن؟**

* مەبەستم ئەوە بوو کە لەگەڵ ئەو هەموو مەلا چاکەی کەوا لەسەدەی حەڤدەهەم لە کوردستاندا هەبووە، ئێمە تەنیا ئەحمەدی خانی و مەلای جەزیری و نالی و سالم و مەحوی مان، بۆ ماوەتەوە. ئەوانە هەموویان توانیویانە بچنە ناو میللەتەکەیانەوە، ئەوجا لەسەر بنەمای تێگەیشتنیان لە کەلتوری میللەتەکەی خۆیان شتێکی تازە فێر ببن. فێر بوونی فارسی و تێگەیشتن لە ڕۆشنبیری فارسی مەرجێکی سەرەکی بووە، چونکە نەک هەر کورد، بگرە تورکیش هەر فارسی فێربووە. کورد کەمتر شیعری بە عەرەبی هەیە، بەڵام شاعیرانمان بە فارسی شیعریان هەیە. بۆ نمونە نالی و شێخ ڕەزا شیعریان بە فارسی هەیە، بەڵام نەمبیستووە شاعیرێکمان شیعری بە عەرەبی هەبوبێ، ئەگەر بوبێتیش شتێکی وا نییە. هەست دەکەم ئەحمەدی خانی و نالی و سالم و مەحوی و ئەوانە، بە تەواوەتی فەرهەنگی سەردەمی خۆیان هەڵمژیوە، بەڵام لەسەر چنجی کەلتورەکەی خۆیان نواندوویانە.

**مەبەستی ئێمە ئەوەی کە بۆ ڕۆشنبیرانی ئێمە نەیانتوانیوە جگە لە پێگەیشتن، لە بواری گرفتی فەرهەنگدا، دەنگ ئاراستەی ڕۆشنبیری گەلانی دەروبەریش بکەن. واتا تۆ دەبینی یەکێکی وەکو ئیسماعیل بێشکچی لەناو ڕۆشنبیری تورکەوە دێت کار لەسەر ڕۆشنبیری کوردیش دەکات. ئەوە دەگەیەنێ کە ڕۆشنبیری کورد نەیتوانیوە چارەسەری گرفتەکانی فەرهەنگی کوردی بکات بە شێوەیەکی فراوان و بە جۆرێك کە بتوانێ ئەو چارەسەرکردنە بکات بە دەنگێك و بۆ دەرەوەشی بنێرێ و ئاراستەی گەلانی دیکەیشی بکات. چونکە ڕۆشنبیر و خاوەن بیرەکانی گەلانی دیکە لە ڕێگەی فەرهەنگ و کاری فیکرییەوە هاتوونەتە**





### ناو گەلەکەی ئێمە؟

*پێموایە دەبێ ئێمە دوو شتمان لەبەرچو بێت؛ یەکەمیان ڕۆشنبیر دەبێ. وریا بێت ئەو وریاییەش بە مەفهومێکی زانستی، واتا لەو قۆناغە تێبگات کە تێیدا دەژی. هەروەها لە هەموو قۆناغێکیشدا هەندێ شت هەیە دەبێ ئەم ڕۆشنبیرە بیزانێ؛ بۆ نمونە دەبینین یەکێکی وەکو ئەحمەدی خانی گرنگترین کاری قۆناغەکەی ژیانی خۆی پێ ئەوە بووە کەوا هاوار بکات بۆ میللەتی کورد و ئەو هەموو میر و بەگ و ئەوانە کۆببنەوە تا دەوڵەتێکی مەرکەزی کوردیی درووست بکرێت، هاوار بۆ یەکگرتوویی نەتەوەیی کورد دەکات، بەمەش مەفهومی نەتەوەیی کوردیی بە مانای خۆی هێناوەتە گۆڕێ. مانای ئەوەیە ئەم پیاوە توانیویەتی لەو قۆناغەدا ڕۆڵی خۆی ببینێ. دووەمیش، ئێمە خوێندەوارانمان لە کۆنەوە، فکریان بۆ ئەوە نەچووە خوێندەواری و ڕۆشنبیری بە مەسەلە کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابوورییەکانەوە ببەستنەوە. ئەمڕۆ کاتی ئەوەیە کە ڕۆشنبیر لە نیگای کۆمەڵەوە سەیری هەموو شتێک بکات. کەشیعر دەنوسێ بزانێ بەشی کۆمەڵگای چەند تێدایە، کە شانۆیەک پێشکەش دەکات بزانێ بەشی کۆمەڵی چەند تێدایە، موشکیلەی کۆمەڵی چەند تێدایە.

**بەشێکی زۆر لەو بەرهەمانەی کە جەنابت وەرتگێڕاونەتە سەر زمانی کـوردی، دەبینین گرنگییەکی زۆر بە یەشار کەمال دراوە. هەموو نووسینەکانی یەشار کەمال و ئەوانەی جەنابت گرینگیت پێداون بە زمانێکی دیکەی جیا لە کوردی، موعالەجەی فەرهەنگی کۆمەڵی کوردەوارین. ئایا جەنابت لەم ڕوانگەیەوە بایەخت بە یەشار کەمال داوە یان هۆکارێکی دیکە هەیە کە خوێنەری کورد نایزانێ، یەشار کەمال چ شتێکە کە تۆ زۆربەی ژیانی خۆت بۆی تەرخان کردووە؟**

*من لە پەنجاکانەوە کەوتومەتە سەر ئەوە کەوا نووسینی ئەدەبیات، دەبێ شتێکبێ کە خەڵک حەزی لێی بێت. ئەوی بەعەرەبی و بە تورکیش دەمخوێندنەوە پتر لەو بابەتە بوون. ئیتر بەڕێکەوت کە من ڕۆمانەکانی یەشار کەمالم خوێندەوە، باسکردنی لە میللەتی کورد پتر ڕایکێشام. خۆم و کەسوکارم و گوند و مرۆڤەکانی کوردستانم لەو نووسینانەدا دەدیتەوە. بەلامەوە ئەو دنیایەی کەکاک کەمال باسی دەکا دنیای منە، دنیای خەڵکی بەدبەختە، دنیای خەڵکانێکە وەکو خۆی دەڵێ ئاسمانی مسەو دەوری ئاسنە، ئەرزە هەرچەند دەکا هیچی بۆ شین نابێ، ئاسمانە هیچی لێ پەیدا نابێت واتا ئەوەی دەمخوێندەوە باسی لە میللەتی کورد دەکرد، نەک تەنها میللەتی کورد، بگرە باسی لەسەرجەم گەلە زوڵم لێکراوەکانی دنیا دەکرد. بۆیە سەرنجیان ڕاکێشام و بوونە جێی بایەخم.

**یەشار کەمال لای خوێنەری وڵاتی ئێمە، لە کوردستانی عێراق و لەوانەیە لە کوردستانی ئێرانیش کە بەم لەهجەیە، بە ئەلف و بێی عەرەبی دەخوێننەوە، پتر لە ڕێی شوکور مستەفاوە ناسرا. واتا خەڵك وا دەزانێ زمانی شوکور مستەفا زمانی یەشار کەمالیشە. مەبەستم ئەوەیە زمانی یەشار کەمال زمانی تورکییە لە کاتێکدا کەش و هەوای نووسینەکان و کەسایەتییەکانی کوردین. خەڵکی کوردستان لە ڕێی شوکور مستەفاوە یەشار کەمال دەناسێ. کاتێ زمانی یەشار کەمال کوردی نەبێ، دەبێ واسیتەیەك هەبێت تا میللەتی خۆشی بتوانێ بیناسێ؟**

* بە داخەوە من تا ئێستا یەشار کەمالم نەدیوە. تەنها







بە وێنە دیتوومە. وەکو برادەرانیش بۆیان گێڕاومەتەوە کە دەیناسن پیاوێکی قسە خۆش و زۆر سادەو کرمانجە.

**هۆی چییە کە بەڕێزتان هەموو تەمەن و بەرهەمەکانی خۆت بۆ وەرگێڕانی کاری ئەدەبی و ڕۆشنبیری یەشار کەمال تەرخان کردووە، کەچی هەوڵت نەداوە بیبینی؟ هەوڵت نەدا یان نەتتوانی یان نەتویست بیبینی؟**

* مەبەستم نەبووە بیبینم. هەرچەندە دوو سێ جاریش چومەتە تورکیا و دەمزانی لە کوێیە، هەروەها لەدەرەوەی تورکیاش دەمزانی لە سویدە، زۆر کەسیش لەوێوە کاغەزیان بۆ دەنووسیم دەیانگوت ئەوە فلان کەس لێرەیە. هیچ ڕۆژێک بە خەیاڵم دا نەهات کتێبێک لەو کتێبە وەرگێڕدراوانەی خۆی بۆ بنێرم. بۆ خۆشم نازانم لەبەرچی. تاقەتم نەبوو، لە ڕاستیدا من پتر مەبەستم کتێب و قسە خۆشەکانیەتی.

**زۆر کاری ڕۆشنبیری جەنابت بریتیبووە لە وەرگێڕانی بەرهەمی نووسەری گەورە. پێتوایە لە بواری وەرگێڕاندا، لەناو ڕۆشنبیری کوردا بۆشاییەك هەبووە لەبەر ئەوە هەموو کاتی خۆت بۆ وەرگێڕان تەرخان کردووە، ئێستا پێتوایە کارێکی باشت کردووە؟**

* حەز و ئارەزو، فاکتەرێکی گرنگی کار و کردەوەکانی مرۆڤن. ڕەنگە ئەو کارانەی لەو قۆناغەدا کردوومن حەزم لێیان بووبێ.

**ئێستا دوای ئەو قۆناغە دوور و درێژە، چۆن ئەو حەزەت هەڵدەسەنگێنی؟**

* ئەو وەختە ڕەنگە پتر خۆم بە ئەدەبیات و ئەوانەوە خەریک دەکرد، بەڵام ئەوە ماوەیەکە دیسان ملم لە مێژوو و لە شتی دیکە ناوە. شتی دیکەش هەبوو بکرێ بە کوردی، بەڵام بە داخەوە مەسەلەی ئازادی و توانای بڵاوکردنەوە و شتی وا، گرفتی دروست دەکرد. هەرچەندە هەرچییەکم کردبێ بەبێ گرفت بۆیان بڵاوکردومەتەوە، یاخود بۆ خۆم ڕێگایەکم بۆ دۆزیوەتەوە.

**ئێستا لە کوردستاندا، جۆرێك لە وەستان و پاشەکشێ لە کاری وەرگێڕاندا هەیە. وەرگێڕان زۆر کەم بووەتەوە. ئەگەر ئەمە بە لایەك لە قەیرانی ڕۆشنبیری کوردی دابنێی، چارەسەرکەی لە چیدا دەبینی؟**

* هەر کارێکی هونەری یان ڕۆشنبیریی، ئەگەر لە تاقیکردنەوەدا سەرکەوتوو بێت، ئەوا پێموایە ئەم کارە نامرێ و درێژەی دەبێ، بەڵام ئەگەر شتێکی کاتی بێت و لە پڕ پەیدا بێ و هەناسەی کورت بێ، ڕەگی تەواوی دانەکوتابێ، ئەوە زوو دەبڕێتەوە و دەمرێ. ئەوەش بە مانای ئەوەی کە خەڵکەکە خۆیان ماندوو نەکردووە، چونکە کاری چاک ماندووبوونی دەوێ، ماندووبوونیش پێوەری کاری چاکە.

**ڕۆشنبیرانی کورد، لەبەر خەریکبوونیان بە خوێندنەوەی بەرهەمی ڕۆشنبیری، فیکری و فەلسەفی بیانی، پتر بە لاسایی کردنەوە خەریك بوون، ئەوەش وای لێکردوون کە بیرنەکەنەوە. تەنانەت لە بواری وەرگێڕانیشدا خەڵك بیر ناکاتەوە خۆی ماندوو ناکات. لەم ڕووەوە ئایا لەناو ڕۆشنبیری کوردیدا پەتای ڕۆشنبیری سەربەخۆی کورد هەیە، یان ڕۆشنبیرییەکەی ئێمە تێکەڵەیەکە لە لاسایی و دەستدرێژکردنی ڕۆشنبیریی گەلانی دەوروبەر؟**

* باسی فکرت کرد، فکر ماڵی کەس نییە ئەفکاری گەورە لە تاریخدا مۆرک و نیشانەی نەتەوەییان پێوە دیار نییە. بۆ نموونە سوقرات و ئەفلاتون لە مەیدانی فەلسەفەدا، فکرەکانیان موڵکی هەموو مرۆڤایەتییە. ڕەنگە ئێمەش زۆر مرۆڤی گەورەمان هەبووبێ، بەڵام بە داخەوە لەبەر ئەوەی بە زمانی خۆیان نەیاننووسیوە کارەکانیان چۆتە حیسابی خەڵکی دیکەوە. ئەگینا ئێمەش مەلای زۆر گەورەمان هەیە بە عەرەبی شتیان نووسیوە و لەمەیدانی فیقهی ئیسلامی و کەلامدا کاری زۆر گەورەیان کردووە.

بۆ نمونە (بەیتوشی)یەکمان هەیە کە لە (نحو)ی عەرەبیدا شتێکی نووسیوە کە هیچ عەرەبێک نەیتوانیوە لەو ئاستە و بەو فراوانییە لێی بدوێت. ئێمە هەموو شتێکمان هەیە، بەڵام لەبەر ئەوەی کیانێکی سیاسی و حکومەتمان نەبووە، نەمانتوانیوە وەکو خەڵکی شانازییان پێوە بکەین.

بەڵێ، هەمانە و دەرنەکەوتووە.

**ئەمڕۆ ژیان لەبەردەم مرۆڤی کورد زۆر قورسە و ئاستەنگ گەلێك زۆرە، مەبەست لە ئاستەنگ، هەر ئاستەنگی داگیرکەر و بیانی نییە، بەڵکو باسی ناوخۆ دەکەم. باسی دنیای دەروونی فەرهەنگی کۆمەڵی کوردەواری دەکەم. ئەو کۆمەڵگەیەی کە هەمانە ناچارمان دەکا وا بیر بکەینەوە کە فەرهەنگێکی**

**گەورەمان نییە. بە دەست ئەم کەموکورتیەشەوە دەناڵێنین، تۆ پێتوایە کە هەمانە، دەکرێ پەنجە بۆ ئەو شتە درێژ بکەی؟**

* پێموایە هەموو میللەتێک و کۆمەڵگایەکی مرۆیی لە هەر قۆناغێکی مێژوویی خۆیدا بیرمەند و پیاوی خۆی هەیە، بەڵام ڕەنگە میللەتێک و کۆمەڵگایەکی دیکە لە رووی ژیاریی و فیکرییەوە لە ئەوەی دیکە پێشکەوتووتر بێ، ئەمەش بەهۆی پێشکەوتنی زەمەنییەوەیە کەوا دەکات هەمووومان شانبەشانی یەکدی هەنگاو نەنێین. ئینجا ئەوە بە مانای ئەوە نییە کە ئێمە بیرو بیرمەندمان نییە، هەموو شتێکمان هەیە، تەنها یەک شتمان نییە، ئەگەر سەقامگیرییەکی سیاسیمان هەبێ خەڵکەکە فێری ئەوە دەبێ کە پتر لەوەی شەڕ دەکات، بیر بکاتەوە.

نەسڵی ئێوە، نەسڵی ڕۆشنبیران و نووسەران، ئەوانەی کە ئێستا لەناو میللەتەکەی ئێمە بە پەنجە دەیانژمێرین، جۆرێ لە خۆشلکردنەوەیان پێوە دیارە. واتا زۆربەیان لەناو مەیدانی پڕ لە تەنگژە و قەیرانی ڕۆشنبیریی کوردیدا، بوونێکی کارایان نییە، ئەمەش لە کاتێکدایە کە جێگرەوەشیان بۆ درووست نەبووە. ئەم دیاردەیەی نەبوونی جێگر و دوورکەوتنەوەی ڕۆشنبیرانی نەسلی ئێوە، لە چیدا دەبینی، پێتوایە ئەمە چارەسەرێکی هەبێ؟

* پێش ئەوەی ئاماژە بە چارەسەر بکەین، دەبێ هۆکارەکان دیاری بکەین. وابزانم زۆر ئاشکران، ئەگەر ئێمە لەم قۆناغە مێژووییەدا بتوانین توانا و لێهاتوویی خەڵک کۆبکەینەوە، زۆر شتی لێ پەیدا دەبێت. ڕەنگە ئەم خۆشاردنەوەیەش نەمێنێت. بۆیە پێویستە بزانین نووسەری چاک و قسەزانی چاک کامەیە، مۆسیقاژەنی چاک کامەیە. بۆ نموونە (مام هێدی) یەک هەیە شاعیرە ئەوە هەر شتێکە لە نموونەی هەژار، ئەوە بۆ لەو مەیدانە بوونی نییە؟ واتا تۆ دەبێ خەڵک ببژێری، ئەمە لایەکی، لایەکی دیکە هەندێ لە گەنجەکان دەستیان داوەتە زۆر بابەتی وا کە ڕەنگە سەدانساڵ بەر لە ئێستا لە ئەوروپا هەبووبێ، کەچی ئەوانە تازە بە تازە دێن باسی ئەم شتانە دەکەن.

**وادەزانی هاتنی ڕەوتی فکری جیاجیا – ئەڵبەتە من ناڵێم چارەسەر بۆ کێشە ڕۆشنبیرییەکانمان دەدۆزنەوە، ڕەوتێکن دێن و دەڕۆن و ئەوانەی کە ڕەسەنایەتییان نەبێ زوو ون دەبن – دیاردەیەکی خراپە یان چاکە، ئەگەر پێت خەراپ بێت ئەوا فەرهەنگ بە چی فراوان و گەورە دەبێت؟**

* ئـازادی شتێکی پێویستە، بەڵام ئانارشیزم نیشانەی نەخۆشییە. لە پاڵ ئازادیدا ئانارشییەتیش هەیە. پێموایە دەبێ جیاوازییەک لە نێوان ئازادی و ئانارشییەتدا، هەبێت پێویستە بەرەوڕووی ئەو کەسانە ببینەوە کە ڕاستییەکان وەکـو خۆیان ناگەیەننە خەڵک، چونکە ئەرکی ئـازادی گەیاندنی ڕاستییە.

**لەگەڵ ئەو کەسە چیدەکەی کە ئازادی وەکو پێویست بەکار ناهێنێ؟**



د. ئیبراهیم یونسی

شوکور مستەفا



* ئەوەی کەوا لە بەڕێوەبەرایەتییەکدا زیاد لە حەددی خۆی دەڕوا و ئامانجی تەنها دەوڵەمەند بوونە و ئەم کارەشی لەگەڵ سرووشتی کارەکەیدا ناگونجێ، چی لەگەڵ دەکرێ؟ لە دەوڵەتێکی پێشکەوتوو و زیرەک و سەرکردایەتییەکی سیاسی کە دڵی بە میللەتەکەی خۆی و مێژووەکەی دەسوتێت چی لێدەکا، دەبێ ئەویش وای لێ بکرێ.

**مامۆستا ئەگەر لە هەمو بوارێکدا لێپێچینەوە هەبێت، لێپێچینەوە لە بواری ڕۆشنبیریدا دەبێ هەر بە ئازادی و بەرەنگار بوونەوەی فیکری بێت. لەم بوارەدا لێپێچینەوە چۆن چۆنییە؟**

*خۆ من ناڵێم بیهێنی دارکاری بکەی. دەڵێم دەبێ لە خەڵک بگەیەنی: بابە ئەوە ئانارشییەتە و ئازدی وا نابێت و ئازادیش ئەوە نییە.

**جا ڕایەکی دیکە لەسەر ئەم بۆچوونەی جەنابت هەیە دەڵێ لە کوردستاندا نەسلێك پەیدابووە، زۆر دەنووسێ و کەم دەخوێنێتەوە. تۆ پێتوایە ئەمە یەکێك لە فاکتەرەکانی ئانارشیەت بێت کە ئەویش لەوەوە دێت کە لە مەسەلە ڕۆشنبیرییەکە باش ورد نابێتەوە؟**

* ئا من پێموایە ئەوانە پتر حەز دەکەن دەرکەون و خەڵک باسیان بکات. ئێمە بۆ خۆشمان هەر وابووین، بەڵام گرنگ ئەوەیە کە سنوورێک لەنێوان ئازادی و ئانارشییەتدا دابنرێت.

**بەلای تۆوە، سنووری ئازادی لە بیرکردنەوە و ژیانی تایبەتی هەر مرۆڤێکدا، چەندە؟**

ئازادی بە مەفهومەکەی من ئەوەیە کە تۆ مەحکومی بە قەوانینێکی جەبری ئەو جیهانەوە کە تێیدا دەژیت. بۆ نمونە ڕۆژێک لە ڕۆژان کابرایەک نەیدەتوانی بفڕێ، چونکە دەبێ لە (یاسای کێش) دوور بێ، بەڵام کە توانیی ئەو یاسایە بدۆزێتەوە ئەوا ئەو کاتە بیر لەوە دەکاتەوە ئەگەر هاتوو توانیی شتێک درووست بکات بفڕێ و نەکەوێتە خوارەوە، ئەوا مانای وایە ئەو ئازادیەی درووست کرد. واتا خۆی لە یاسا سەپاوەکە ڕزگار کرد، لێرەدا ئەمە ئازادییە.

باشە ڕەنگبێ لەسەر دۆزینەوەی ئەم یاسایەی کە ئێستا باستکرد، کۆمەڵێ بیروڕا هەبێت، کەواتە دەبێ بوار بۆ گفتوگۆ بهێڵدرێتەوە.

* هیچ مانیع نییەو دەبێ بوار بۆ گفتوگۆ هەبێ، بەڵام گرنگ ئەوەیە نەیکەین بەشەڕ و یەکتری تاوانبار نەکەین. نەڵێین ئەو جاسووسەو ئەوە پیاوی ئەو و ئەوە. کەواتە کاتێ ئەمە سوودی دەبێت کە تۆ لەمەیدانی خۆتدا ئازادی بەکار بێنی، بەڵام گرنگ ئەوەیە بۆ دۆزینەوەی ڕاستییەکان بەکاری بێنی.

**ئەو شێوەیەی کە تۆ بۆ گفتوگۆی فیکری و ڕۆشنبیریی دادەنێی، لە ئازادی لیبراڵی فیکریی نزیکە، لە مەسائیلی فکریدا بڕوات بە لیبراڵیەت هەیە یان نا؟**

لیبراڵیەت لە قۆناغ و سیاسەتی خۆیدا، خۆی دەسەپێنێ و ئەمەش بە دەست من و تۆ نییە. یان گەڕانەوە بۆ دواوە و دابڕان، ئەمانە بۆ خۆیان درووست بوونە و نە لە دەسەڵاتی من و نە لە دەسەڵاتی تۆشدا نییە، بەڵام رادیکاڵیەت هەیە، دیکتاتۆریەتیش کە خۆی دەسەپێنێ. ئەم دیکتاتۆرییەتە بۆچیە؟ ئایا هیچ سوودی هەیە؟ جاری وا هەیە دیکتاتۆرییەتیش وەکو پێویستییەکی لێدێت، بەو مانایەی کە زۆر جار پێویست دەکات کۆمەڵگا لە بەرەڵایی و دەستدرێژی و پیاوی خەراپ دوور بخرێتەوە و ڕێگە نەدرێت کە راستی مرداربێتەوە. کەواتە لێرەدا دیکتاتۆرییەت شەرعیەتێکی مێژوویی پەیدا دەکات، بەڵام نەک بۆ هەتا هەتایە، چونکە دیکتاتۆرییەتی هەتا هەتایی، هیچ ئامانجێکی نابێ.

ڕایەک هەیە کەوا شوکور مستەفا لە بواری بیرکردنەوەدا پتر بەلای فەلسەفەی مارکسییەوەیە. ئەوەی ئەمڕۆ لە سەردەمی بە جیهانیبووندا هەیە، ئەوەیە کە دنیا بووبێتە گوندێکی بچوک و لە گونجێکی بچوکیشدا گفتوگۆ و هاوارکردن بەسەریەکتریدا کارێکی ئاسانە. جاری وا هەیە ئەم گفتووگۆ و هاوارکردنە چارەسەری زۆر خێرا بۆ کێشەی گەلانیش دێنێتە ئاراوە. نمونەش میللەتەکەی ئێمەو دۆستەکانمانین کە ئەگەر ڕاگەیاندنی جیهانیی کارەساتەکانمانی بە دنیا نەگەیاندبایە لەوانە بوو ئێستا ئەو هاریکاری و چەترەمان بۆ هەڵنەدرابا کە هەمانە.

* من نەک هەر قەرزارباری مارکسییەت، بگرە قەرزارباری زۆر شتم. قەرزارباری هەموو شتێکم کە لێی فێربوومە. ڕۆژگارێک تەسەوفیشم دەخوێندەوە. زۆرم پێخۆش بوو، تەنانەت کاریشی تێکردم. من کوردم و حەزدەکەم وەکو ئەو میللەتانە ببم بە شتێک، لە مارکسیەت و تەسەوف و مەلا و شێخ و ئاغاو...هتد، هەرکام بتوانن وا بکەن کە ڕزگار ببم ئەوا لێیان مەمنون دەبم.

# وتاره تەواو نەكراوەكان




شوكور مستەفا كێلی گۆڕەكەی مام هەژار ماچ دەكات

ئەم سێ وتارەی مامۆستا شوكور مستەفا، بەشێكن لەو وتارە تەواو نەكراوانەی كە مردن ڕێگەی نەدا تەواویان بكات و بە تەواونەكراوەیی بەجێیهێشتن..

یەكەم وتاریان بەناونیشانی بیرو ئەندێشەی ئیسلامی، لەم وتارەدا شوكور مستەفا لەسەر چەمك و ژیار و ئەندێشەی ئیسلامی ڕامانێكی قووڵ دەكات و چەمك تێڕوانینی نوێ و جیاوازی لێ بەرهەم دێنێت.

وتاری دووەم بەناونیشانی ماركسییەتی وجوودی، لەم وتارەشدا باس لەگۆڕان و قۆناغی گۆڕانكاری بیروباوەڕی ماركسی دەكات و قۆناغی وەستان و پاشكەوتن و گرفتە جەهەرییەكانی ماركسی و وجودی دەخاتە ڕوو.

لەسێیەم وتاردا كە تەنانەت ناونیشانیشی بۆ دانەناوە باسێكی مێژوویی تەواو نەكراوە لەسەر مێژووی كورد و دەرەبەگایەتی و قۆناغی گەشەكردنی كۆمەڵگەی كوردی دەكات.

پێمان خۆش بوو وەك سێ بابەتی تەواو نەكراو و بڵاونەكراوەی مامۆستا شوكور مستەفا لەم ژمارە تایبەتەی ڕۆڤاردا وەك خۆیان بڵاویان بكەینەوە.

ڕۆڤار

# بیروئەندێشەی ئیسلامەتی

بۆ لە چارچێوەگرتنی بیر و ئەندێشەی ئیسلامی، ناکرێ تەنێ لە ژمارەیێ ڕەگەزی جۆراوجۆری ئایدیۆلۆجیاگەلێ کە لەگەڵ ئیسلامەتیدا بەرەنگاربوونەوە وەکۆڵین و بەس، بەڵکو دەبێ بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم خاڵە بکۆشین کە چ هەلومەرج و هۆکارەیلێ ڕێگای بۆ کاریگەریی ئەم ئایدیۆلۆجیانە لە ئیسلام خۆش کرد؟ بێ گومان، زانیاریگەلێ کە لەمەڕ بارودۆخی سازمانی ئیسلامیی لە سەروبەندی چاریاری پێغەمبەردا، وەک مێژوونووسانی ئیسلامیی نووسیویانن، ڕەنگدانەوەی کوتومت، یان نیوەدەقاودەقی بارودۆخی ڕاستەقینەی ئەو سەروبەندە نییە. وێنەیەکی کە ئەوان کێشاویانە، بێگومان زۆری پێوەنراوە و فرەی وە شان و باهوودا هەڵگوتراوە. کارەکە، کە زێتر لە نیگای لە مەیل و ئـارەزووی شەخسیی و خۆشنواڕین و گەشبینیی ئەم دەستە و ئەو دەستەوە بەو لاوە نەترازاوە و ئەمەش ئاوێنەی هەڵکەوتی بارودۆخەکە نییە و بەڵکو باسی ئەوەیە کە ئەم، یان ئەو مێژوونووس بۆ خۆی چۆنی حەز لێبووە ئەوهای نووسیوە.

کۆمەڵی عـەرەب لە سـەرەتـاوە: لە سەروبەندی پێغەمبەر و ساڵانی دوو یاری ویدا، ئەبوبەکر و عومەر، سازمانێکی ئایینی بوو، واتە: فەرمانڕەوایی ئەشرافی، بە مانای تەواوی وشە، بەکردەوە نەبوو. لەو سازمانەدا هەر فەرمانێکی یاسایی، یان کارگێڕیی، هەر وەک فەرمانێکی ڕاستەوخۆی خوداوەند قبووڵ دەکرا. دەشێ وای بۆ بچین کە شێوەی ژیانی ئەبوبەکر و عومەر، یان شێوەی ژیانی هەر ئەندامێ لە ئەندامانی کۆمەڵ، بگرە دەگەڵ ژیانی ئەوانەی کە لە ڕووی ماددییەوە کەمتر دەسەبەر بوو، فەرق و سوویەکی ئەوتۆی نەبوو.

### ٢ ـ سەرەتای پەیدابوونی بنەمای ڕامانەکی (نظری)

پێش وەی لـە قۆناغەکانی پاشانەکیی بزاوتی تەسەووف وەکۆڵدرێ، دەبوا کورتە دیاردەیەک بۆ ئەو لێشاوە فەلسەفییانەی کە لەو سەروبەندەدا لە وڵاتانی ئیسلامیدا تەشەنەی کرد، بکرێ. بەدەم ڕۆژگارەوە سوننەت، سیستەمێکی فەلسەفییانەی نەبوو و کۆمەڵە حەدیسێکیش ئەگەر بـۆرە سیستەمێکیان هەبوو، دەستەبەندییان تەنها لە ڕوانگەی ئەزموونی ئەنجامی پێویستییەکانی ئایینییەوە بـەدی هاتبوو. ئەوانە ڕەوشت و ڕەفتاری ئیماندارانیان دەستنیشان دەکرد، بەڵام بەشبەحاڵی بڕیاردراوگەلی ئەسڵیی ڕامانەکی، بۆشاییەکی هەراوی بۆ ئەندێشەی فەلسەفیی هێشتبۆوە. ئیسلامەتی بۆ ئەوەی بێتە ڕیزی گەورەترین ئایینەکانی جیهانەوە، پێویستیی بە بەڵگە و پاساو و دەسپێکی فەلسەفی هەبوو؛ چونکە بڕیاردراوگەلێ کە وەڵامدەرەوەی



شوکور مستەفا



پێویستی و ئاتاجی تـیـره و هـۆزه چۆڵـنـشـیـنـەکـانـی عــەرەب بـــوون، لە پـاش بـڵاوبـوونـەوه و تـەشـەنـەکـردنـی ئـیـسـلامـەتـی لـە دەرەوەی عەرەبستان، پـێـویـسـتـیـی بـە لێ زێـدەکـردنـێـکـی زۆر هــەبــوو. لــەمــەش بـتـرازێ، ئیسلامەتی لەپاش تەشەنەکردنی



لە دنیایەکی پان و بەریندا، دەگەڵ زنجیرە ئایینەیلێکی کۆنی وەک: ئایینی جولەکە، زەرتوشتی، عیسەوی و مانیگەریدا سەروساختی پەیداکرد کە پێشترێ ئەمانە هەریەکە بۆ خۆیان پایەیەکی ڕامانەکییان پەیداکردبوو.

ئەم سەروساخت و پێوەندی دەگەڵ یەکدیدا پەیداکردنە، بۆ خودی خۆی، خواستێکی تازە نەبوو، چوون سریشتەیلێ لە هەموو ئەم ئایینانە پێشترێش لەویدا هەر هەبوون. گرینگ ئەوەبوو کە ئیسلام پاش ئەوەی بوو بە ئایینێکی ڕەسمی، دەبوا زێدەسەرباریی خۆی، ئەفزەڵییەتی خۆی بە جۆرێ لە جۆران، بەرانبەر سەرلەبەری ئایینەکانی دیکە نیشان بدا. هەڵبەتە جاڕچی و بانگەشەکەران لە ئاوها بارەیلێکدا، بە زۆری سواری گای هار دەبوون و پەنایان بۆ زۆرەملێ و کەڵەگایانە بیروبڕوا سەپاندن دەبرد و کێشەکانیان لەم ڕێگایەوە دیزە بە دەرخۆنە دەکرد. بەڵام ئەم بایە هەمیشە هەر لەو کونەوە نەدەهات و لە هەموو شوێنێ ئەمە سەری نەدەگرت. هێندێ جار کارەکە وای دەویست کە دەبوا کێشەکە لە چارچێوەی ئەنجامگریی بەیانی و زاروپل پاراویدا گوتووبێژی لەمەڕ کرابا. عیسەوییەکانی موخالیفی ئیسلام لە مەودای حەوت سەتە لە پێش ئیسلامدا توانیبوویان دە ململانێ لەگەڵ دەستە جۆراوجۆرەکانی موخالیفیاندا ڕێگایەکی دووروردرێژ ببڕن و لە شورایەکانی کلیسایەکاندا فەزڵ و هونەرێکی یەکجار ناسک مەترەح بکەن و لەگەڵ زەرتوشتییەتدا چۆن ڕەفتارکردنیان دەتوانین بۆ ئەمە بە شایەت بگرین. واتە: هەروەک مەسیحییەت دەبوو سەرلەبەری هێزەکانی خۆی بۆ دامەزراندنی سیستەمێکی ڕوختە و مەحکەم بۆ بەرانگاربوونەوەی دەگەڵ بیروبڕوای دژ بە وی کۆک و تەیار بکا، ئیسلامەتیش هەر بە هەمان شێوە دەبوا سیستەمێکی تەواو عەیاری بۆ بەرەنگاربوونەوەی دەگەڵ هەموو بیروبڕوایەکی دژ بە خۆی، کۆک و تەیارکا.

پێکهاتنی ئەم سیستەمە دەگەڵ پەیدابوونی دەستەگەلی جۆراوجۆردا کە هەریەکە هەوڵی دەدا وەڵامێ لەبۆ کێشە بنەڕەتە فەلسەفییەکان بدۆزێتەوە، دەستی پێکرد. بەڕاستی شرۆڤەی مێژووی پەیدابوونی هەموو ئەم دەستەجاتانە و دەگەڵ یەکدیدا ململانێیان - وەزیفەیەکی زۆر بە گیروگرفت بوو. وێڕای ئەوەی کە نمایناني ئەم دەستە و گرۆیانە فێرنامەی خۆیان لەسەر کاغەز دەنووسی، وەلێ ئەمڕۆ چتێک لەم جۆرە نوسراوانە بۆ ئێمە بەجێ نەماوە. ئەوەی کە هەبێ تەنها هەر ئەوانەن کە پێشترێ یەکەم دەستە و گرۆیەکانی ئیسلامی بە پێی زانیاریگەلێ کە لە مێژوونووسانیان وەرگرتوون، یان بە پێی نامیلکەگەلی موسڵمانانی حەنەفی نووسراون، دەشێ داوەری بکرێ. بەڵام ئەم باسانە لەوە بەدەرن کە پشتیان پێ ببەسترێن، چوون نمایناني هەر خێوی ئایدیۆلۆژیایەک، کە خۆیان بە هەقدار دزانی، هەوڵیان دەدا تا بتوانن موخالیفانی خۆیان تۆمەتبار بکەن و بە ناهەقیان لەقەڵەم بدەن و مێژوونووسانیش هەر هەڵپەی ئەوەیان بوو ئەم دەستە و گرۆیانە دەستەبەندی بکەن و ژمارەیان بە هەفتا و دوو بگەیەنن و حافز گوتەنی: «جنگ هفتاد دو ملت همەرا عذر بنە / چون

ندیدند حقیقت ره افسانه زدند» و لەم مەسەلەیەدا حەدیسێکان کردبوو بە دەسپێک و بیانوی خۆیان کە بە پێی ئەم فەرموودەیە، گۆیا پاش کۆچی پەیامبەر دەبوا ئۆمەتەکە ببوونایە بە حەفتا بەش (یان حەفتا و دوو بەش)ەوە کە لە نێوان ئەمانەدا تەنها یەکێکیان لەسەر ڕاستییە.

بەش بەحاڵی خەواریجەکان، (واژەکە فرێ بەسەر واژەی «خارجی»ی عەرەبییەوە نییە، بەڵکو لە ناوی گرداوی «خارگ»ەوە هاتووە کە پاشان بزاوتی قەرمەتییەکانی تێدا پێ گەیشت (١) و هەر لە کۆنەوە مەڵبەندی بزاوتە ناڕازییەکانی پێش ئیسلامەتی بووە) جگە لە بیروبۆچوونی سیاسی، بیروبۆچوونی دیکەشیان هەبوو کە سەروکاری بە چییەتیی ئیسلامەتییەوە هەبوو، ئەوەش ئەوەبوو کە گوناهی گەورە چ ئاکامێکی لێ دەکەوێتەوە، لە نیگای ئەوانەوە هاتەگۆڕێ و مەترەح کرا. لە بارەی ئەم کێشەیەوە خەواریجەکان بۆ خۆیان لە سەر یەک ڕا کۆک نەبوون. ئەزاریقەکان واتە: سەختگیرترین دەستەی خەواریج لەو بڕوایەدا بوون کە ئەگەر موسڵمانێ گوناهێکی گەورەی لە دەست قەوما، ئیدی ئەوە موسڵمان نییە، واتە: لە ئایین وەرگەڕاوە و بە ئەشکەنجەدانی هەتاهەتایی دۆزەخ گرفتار دەبێ و لەم ڕووەوە هەر موسڵمانێ بۆی هەیە کە گوناهکارەکە بکوژێ و بۆ ئەوەی لە سزای ئەو قەتڵە بەری بێ. ئەزاریقە نەک تەنها هەر خودی گوناهکارەکە بەڵکو نەوە و نەتیژەکانیشی دەبوا بکوژرێن و مافی هیچ داکۆکی لە خۆکردنێکان نەبوو. ئاشکرایە، کە لە سەروبەندی شەڕەکانی براکوژیدا (سەتەی حەوتەمی ز.) ئەم بیروبۆچوونە سەختگیرانە چ سەرەنجام و گۆتاوەڕۆیەکی ترسناکیان بە دوادا هات. دەستەی صوفرییە کە مەیانەڕۆتر بوون تەنها خودی گوناهکارەکەیان بە شایانی کوشتن لە قەڵەم دەدا. هەروەها دەستەی نەجادە لەو بڕوایەدا بوون کە دەبوا کوشتنی کابرای گوناهکار بە ڕای هەموو دەستەی ڕاوێژکاران (جماعت) بەڕێوەبچێ. عیبادییە لەمان مەیانەڕۆتر بوون، گوناهکاری گەورەیان وێڕای ئەوەی کە بە کافر دەزانی، وەلێ وەک بتپەرستیش نەبوو. مورجیئە بڕوایان وابوو کە گوناهکاری گەورە نەک تەنها هەر کافر نابێ، بەڵکو دەتوانێ، وێڕای گوناهکاربوونی، بە ڕزگاربوونی خۆی ئومێدەواربێ. بنەمای ئەم نواڕینە ئەوەبوو کە لێبووردن و بەخشین بە پێی دەقی ئاسمانی، لە تایبەتیترینی سیفاتەکانی خوداوەندییە و تۆڵەساندنەوە دەگەڵ میهرەبانی و بەزەیی ویدا هاوخوان نین و ڕێک ناکەون.



د. ئیبراهیم یونسی　　　بارام ولد بەگی　　　شوکور مستەفا



شوکور مستەفا

مورجیئە هەنگاوێکی لەمە هەراوتریان نا: بە گوێرەی ڕێنوێنییەکانی وان، ئیمان کارێکە ڕاستەوخۆ پێوەندیی بە بڕوای لەدڵەوە هەیە. موسڵمان تەنانەت ئەگەر ئیمانی لە بەکردەوەش بەدیارنەکەوێ دیسان هەر ئیماندارە، سەرباریش ئەگەر لە دڵی خۆیدا ئیماندار بێ، تەنانەت بە شێوەیەک کە بە ڕواڵەتیش ڕێوڕەسمی بتپەرستان، یان عیسەوییانیش ئەنجام بدا، دیسان هەر بە موسڵمانی دەمێنێتەوە. وەلێ ئەم باوەڕە دەبێ بە ئارەزوو و مەیلی ئازادانەی لەدڵەوە بێ، نەک بەرهەم و ئەنجامی بەزۆرملێ و داسەپاندن. بە کورت و کرمانجی، مورجیئە کێشەی سەرپشکی و خوایشت کە یەکێ لە بەگرێوگۆڵترین کێشە فەلسەفییەکانە مەترەح دەکەن و دەیخەنە ئاراوە.

ئـەم کێشەیە دوو دەسـتـەی دیـکـەش: جەبرییە و قەدەرییەش پێوەی سەرگەرم بووگن. جەبرییە نکوولی لە سەرپشکایەتی و ئیختیاری مرۆڤ دەکەن. بە بڕوای وان هەر کردەوەیێ بە ئیرادەی خوداوەندی ئەنجام دەدرێ و مرۆڤ تەنها هەر ئەوەی بۆ هەیە، کە ئەو ئیرادەیە جێ بە جێ بکا و بەس. هێندێ گرۆگەلی دیکەی ئەم دەستەیە هەن هەنگاوێ بەولاترەوەیان ناوە و وای بۆ چووگن کە خوایشتی مرۆڤ هیچ نرخێکی نییە و ئیدی بەم جۆرە بیروبڕوای وان بە پێچەوانەی قورئانەوە بوو؛ چونکە وێڕای وەی چارەنووس لە قورئاندا پلەوپایەیەکی بڵندی هەیە، وەلێ هیچ کاتێ ئاوها بڕوایەکی بە چەندوچۆن بەش بە حاڵی چارەنووس و قەدەر سەرمەشقی بۆ لەسەر دانەدراوە.

قەدەرییە ویستی مرۆڤیان بە ویستێکی هەر بە تەواوەتی ئازاد دەزانی و بەم جۆرە مرۆڤیان بە بەرپرسی ڕەفتار و کرداری خۆی لەقەڵەم دەدا.

لە قورئاندا چەندین جار خودا بە تاکوتەنهازانینی ڕەها و بێ سەرحەد و سنوور بە بیردەهێندرێتەوە و سیفاتێکی وەکو زانا (عالم، علیم)، بینا (بەصیر)، بیستیار (سمیع) و هتد... بۆ پەروەردگار دەگوترێن. لەم ڕووەوە خۆ بە خۆ پرسیارێ لەمەڕ چۆنیەتیی سەروکاری ئەم سیفاتانە بە زاتی ڕەها و موتڵەقەوە، هاتنەگۆڕێ.

سادەترین ڕێگاچارەسەری ئـەم کێشەیە موشەبیهە، پێشنیازیان کرد و ویستیان کە هەموو ئەم سیفاتانە، ڕاستەوخۆ بە هەمان مانای ڕەواڵەتە قبووڵ بکەن. وەلێ ئەوها تێگەیشتنێکی ڕاستەوخۆ و ڕەواڵەتە، لە سەرێکەوە دەگـەڵ مەعنەوی بوونی زاتـی خـوداوەنـددا دووفـاق بوو و لە سەرێکی دیکەوە ددان نان بە هەتاهەتایی ئەم سیفاتانەدا، بیر و ئەندێشەی فەلسەفیی ڕوو لە فراژووبوون و پێگەشتنی دووچاری چەواشەیی دەکرد: ئەگەر سەرلەبەری ئەم سیفاتە هەتاهەتاییانە لە زەمان بـەدەرن، ئەمە مانای ئەوەیە کە لەبۆ بوویەکی ڕووت دەبێ بوویەتیی چەند چیەتییەکی دیاریکرا و و کۆنکرێتی دیکەش قبووڵ بکەین، بە مانایەکی دیکە کارەکە بەلای کفردا دەشکێتەوە. ڕوونە کە هەر هەمان پرس، بوو بە مایەی وتووێژ و گوێپچڕ گوێپچڕ و کێشە و هەرایەکی یەکجار توند و تیژی پاشان و سەرهەڵدانی دەستەی موعتەزیلەی لێ کەوتەوە کە سەرنجکێشترین دەستەکانی ئیسلامەتین.

بۆ دوایهێنان بە ژماردنی دەستەجاتە گرینگەکان، نـاکـرێ باسێکی دەسـتـەی «باتینییە»ش نەکەین کە لە پاشان دەسـتـەی بەهێزی ئیسماعیلییەی لێ کەوتەوە. ئیسماعیلییەکان داوای بە مەجاز و ئیستیعارە (تەئویل) لێکدانەوەی قورئانیان دەکرد و بە یاریکاریی ئاوها لێکدانەیەوەیێ، واتـە: تەئویل (هێرمینۆتیکا) فێرنامەکانی نوئیفلاتوونییان لەمەڕ گیانی ڕەها کرد بە ڕامانە و تیئۆریی خۆیان. هەروەها نابێ باسی دەستەی حەمامادییەش لە بیر بکەین کە فێرنامەی لەمەڕ دۆناودۆن (تناسخ)یان قوبووڵ کردبوو و لەو بڕوایەدا بوون کە خوداوەند مەیموون و بەرازانی لە گوناهکاران گوراندوون، واتە: بیروبڕوای وان دەگەڵ بیروبڕوای هیندوواندا بە ڕاشکاوی هاوخوان و وەک یەکدی بوون.

جا بۆ وەی کە بزانین هەر لە سەرەتای یەکەم سەتەی کۆچی (ئاخروئۆخری سەتەی حەوتی لە دایک بوونی عیسای مەسیح) ڕا، ئەندێشەی فەلسەفی چ بزاوتێکی توند و تیژی هەبووە و چۆن چۆنی بیرمەندانی ئیسلامی دە هاوسەروساختییان وەک گشت ڕامانە و تیئۆرییەکان ناچار بوون بە هۆڵی مەسەلەگەلێکی فر وە گرێوگرڵترەوە بن.

# مارکسییەتی وجوودی

شوکور مستەفا



سەرمەشق (پارادیگما)ی مارکسییەتی ئەرتەدۆکس لە پاش شەڕی یەکەمی جیهانی ئیدی نەیدەتوانی گۆڕانکاریگەلێکی وەک پەیدابوونی فاشییەت و کز و بێ هێزبوون و ئاشبەتاڵی بزووتنەوەکانی کارگەری و نوێبوونەوەی سازمانی دەوڵەتی سەرمایەداری ڕوون بکاتەوە. دەربڕین و گوزارشتی جۆراوجۆری مارکسییەتی فەلسەفی و میسالییەت دە کاردانەوەدا بەرابەر بەم گۆڕانکارییانە و بە نیازی پینەوپەڕۆکردن و لەنوێڕا ڕۆنانەوەی سەرمەشقی ئەرتەدۆکس وەبەر باس و لێوەکۆلێن ئێخرا.

لە پاش شەڕی دووەمی جیهانی نائومێدبوونی بەرەی لاوان لە میراتی ڕابردوو و پەیدابوونی شەپۆلێکی نوێ لە ناڕەزاییی ڕۆشنبیری، بنەمای مارکسییەتێکی تێکەڵ بە هێندێ فەلسەفەی دیکەی ئامادە کرد. سەروساخت لە نێوان مارکسییەت و وجوودییەتدا لە بەرهەمی بیرمەندانی وجوودیگەریی وەک «چۆن بۆڵ سارتەر» و «مۆریس مەرلۆپۆنتی» نموونەی زەق و زۆپی ئەم تێکەڵی و هەڕەمەیییە بووە. وڵاتی فەرەنسە ناوچەقی بیری لێکجووتبەقێکردنی مارکسییەتی وجوودییەت بووە. بە گشتی، لە دەیەی ١٩٣٠دا، لە فەڕەنسە، لە ژێر کاریگەریی تەشەنەکردن و تەنینەوەی پێوەندییە فەلسەفییەکان بە هیگڵەوە و هەروەها بە هەرمێن و برەوکەوتنی ڕەواڵناسی و وجوودییەتی ئالمانی لەو وڵاتەدا، بە پیرەوەچوون و پێشوازییەکی ئەندێشەیی نوێ، بەش بە حاڵی مارکسییەت، هاتەگۆڕێ. ئاشکرابوونی بەرهەمە فەلسەفی و مرۆدۆستییەکانی لاوێنیی مارکسیش لەم بارەوە کاریگەر بوو. یەکێ لە کۆششت و هەوڵەکانی عومدەی نوایین، کە بۆ تێکەڵبوونی مارکسییەت و وجوودییەت بە خەرج دراوە، دەبێ لە نووسینەکانی، ئالێکساندەر کوژوو، لێکدەرەوەی فەلسەفەی هیگڵدا منەیی بکرێ کە نووسینەکانی نواییینی مارکسی بە نیازی لە خەڵک گەیاندن و ڕوونکردنەوەی ڕەواڵناسیی ڕۆحی هیگڵەوە بەکاربرد. هەروەها لە نووسینەکانی «هانری لفور» مارکسیستی بەرجەستەی فەرەنسیدا دەتواندرێ نیشانەگەلێکی فرە لە دەربڕین و گوزارشت و لێکدانەوەی بیر و ئەندێشەی مارکس بدۆزرینەوە. بەڵام مارکسییەتی وجوودییانە پیاو هەق بێژێ، بە تایبەتی بەرهەمی بیری «سارتەر» و «مەرلۆبۆنتی»بووە. ئەم جۆرە گوزارشت و دەربڕینە لە مارکسییەتیش لە گوێن لێکدانەوەکەی «هورکهایمەر» و «مارکووزە» گوزارشت و دەربڕینێکی ڕۆشنبیر پەسەند بووە. وجوودییەت بۆ خۆی وەک یەکێ لە لێشاو (تیار)ەکانی کەڵە ئەندێشە، لە سەدەی بیستەمدا کە جەختی لەسەر چەمکەیلێکی وەک سەرپشکایەتی و لە کاردا ئازادیی مرۆڤ و گرینگیی پراکسیسی مرۆڤەکی، دەگەڵ چەند پاژێ لە مارکسییەتی مرۆدۆستی و فەلسەفیدا هاوسەر و ساختی هەبووگە. لە سەرێکی دیکەوە هێندێ لە ئوسووڵی بنەڕەتانەی وجوودییەت، لە گوێن بە پووچزانیی فەرایەندەکانی مێژوو و جەخت لەسەر زیهنییەت (بڕوا بەوە کە ئەوەی هەیە تەنها ئەو چتانەی ناو مێشکتە و هیچی تر، واتە: چت، وەختێ وجوودی هەس کە تۆ بیری لێ بکەیەوە و بەس و وەک بێژی هەرچی لەم جیهانەدا هەس، ئەگەر تۆ بیری لێ نەکەیتەوە، وجوودی نییە) و تاکایەتی ڕاستییەکەیت گەرەکە، فرێ وەسەر مارکسییەتەوە نەبووگە.



د. مارف خەزنەدار　　　　　　شوکور مستەفا

# هەروەك حەسەنی ڕووملّوو و گونابادی و عەبدولفەتاحی فومەینی

و ئیسکەندەر بەگی مونشیی تورکمان و هاوسەردەمانی دیکەی خۆی، ئەو جەماوەرانەی کە لە سیاسەتی ئاغا و دەرەبەگی زۆردار ڕاپەڕیون، بە تاڵانکەر و یاخی نێوبردوون.

شەرەفنامەی بەدلیسی ڕێی بۆ ئیسماعیل پەلستەر ناوێکی بە ڕەگەز ئەرمەنئووت خۆش کرد کە فێڵێکی گەورە بۆ تورکی عوسمانی لە کوردان بکات و کتێبێکی ساختە بە سەرناوی «کردلر»ەوە بە زمانی ئاڵمانی و گۆیا نووسینی د. فرێجی ئاڵمانیایی، بنووسێ و بە ناوی ئەکادیمیای ئۆریانتالیستیی بەرلینەوە بڵاو بکاتەوە و پاشان تورکە عوسمانییەکان بە ناوی دەزگای تەرجەمە و نەشریاتی زمانانی ئاوارە و کۆچکردوانی دەوڵەتی عوسمانییەوە ئەم کتێبەیان وەک هەنگیان لە دیواردا دۆزیبێتەوە کردووە بە تورکی و پێشەکییەکی پڕ لە درۆ و دەلەسە و ئەفسانەئامێزیان بۆ هەڵبەستووە و بڵاویان کردۆتەوە و ڕۆشنبیرانی ئەو سەرزبەندە، بە تایبەتی کامەران بەدرخانی بەهەشتیی وتارێکی پەسنئامێزی لەمەڕ نووسیوە و بە نیشانەی هەڵاتنی ئەستێرەی بەختی کوردی لە قەڵەم داوە و ئەنجامدانی ئەو کارەی لە لایەن «دەزگای تەرجەمە لە زمانانی ئاوارانی دەوڵەتی عوسمانی»یەوە بە نوخشەی کاری لە دواڕۆژدا زێتر ئەنجامدان داناوە. بەندە ئەم نەقڵەم لە کتێبەکەی کاک مالمیسانژ، بەدرخانییەکانی جزیر و بۆتان کە کردوومە بە عەرەبی وەرگرتووە. بەڵام ئەم وردە ڕەخنانە لە پلە و پایەی بەدلیسی کەم ناکاتەوە، کورد گوتەنی «عەیب لە کیژی قازییش دەگیرێ».

شەرەفخان بە پێی بیروبۆچوونی مێژوناسیی کوردی سەدەی ١٦ هەم پیاوێکی ئەنسیکلۆپیدیش بووە. تەشەن بە فەرهەنگی سەروبەندی خۆی بەن کارێکی گەورە زانیوە. لە شارۆچکەی بەدلیس ٥ فێرگەی ڕاناوە. بەدلیس بۆ بەرەی دواڕۆژ کتێبخانەیەکی دەوڵەمەندیشی بە یادگار بەجێ هێشتووە، بەڵام بە داخەوە بە دەستی مەلیک ئەحمەدی ملهوڕ، فەرمانڕەوای وانێ بە تاڵانی براوە و نەیاری تورکی بە خوێنی سەری کورد تێنی و داگیرکەری کوردستان چۆڕ و ئاسەواری لە فەرهەنگی کوردەواری بڕیوە و هەروا دەیبڕێ و ئێمەش جارێ هەروا خەریکی گیرفان تەژی کردنین...

هەژار وەک خوێندەوارێکی ڕۆشنبیر، تا وەشگەڕا کەرەجێ لە ئێرانێ لە چارچێوەی هێندێ زانیاریی

سەرزارەکی و زارگۆتی و دەماودەم و گوێ ئاگردان و کۆڕ و مەجلیس و مزگەوت و خانەقادا دەخولایەوە، ڕاستە لە عیراقێ عەرەبییەکی بە قەولی مەلای کوردان کتێبی پەڕسپی فێر ببوو و ڕێی کەوتە سەنەتۆریۆمی «بەحەنەس» لە لوبنانێ و گوندی توربەسپیانی ماڵە حاجۆ ئاغا لە بۆتانێ و مەسکەو شامێ و لەو وڵاتانەدا ئەوەندەی پێی کراوە کتێبانی بە زمانانی کوردی و عەرەبی و فارسی خوێندوون، لێ بە پێی بەرنامەیەکی ئەکادیمیانە، یان بۆرە ئەکادیمیانە کاری نەکردووە؛ لەبەر هەندێ کون و کەلێنی هەراو لە هەمبانە بۆرینەی زانیاریدا هەبوو، حەزی لە فەلسەفە نەدەکرد، کەیفی بە ڕێزمان و مێزمانی بە زۆرەملێ و کرچ و کاڵانە بەسەر زمانی کوردی دا سەپاندن و چۆن شیعر دەنووسرێ و کوو داستان و ڕۆمان دەنووسرێن و تەرجەمە چۆن دەکرێ، نەدەهات. دەتوانم بێژم: کە پتر بە سەلیقە و مجێزی ڕەوانی زۆربەی شێوە کوردییەکان پشت ئەستوور بوو و کوردییەکی پوختی ناوچەی موکریانی باش دەزانی. تەرزی بیرکردنەوەی جیهانبینیی لە هەڕەمەیەکی نیوە وجوودییانە و نیوە ماتریالستانە و نیوە ئایدیالیستانە نەترازا. سەروساختی دەگەڵ شیعری عیرفانیدا خۆش بوو، وەلێ زۆری ڕک لە شێخی ساختەچیی لە «سەر تا پا شین» دەبۆوە و زۆری فڕئاوێتوونێ. تا ڕادەیەک لە گوێن دیۆجین، فەیلەسووفی نامێی یۆنان «کەلبی» مەزەوانەی بوو، زۆری گوێ بە ڕوواڵەت و بەزەک و دۆزەکی ژیان و خۆشگوزەرانی نەدەدا، لەسەر کوردایەتی قسەی لە کەس نەدەخواردەوە. جارێکیان لە ماڵە کابرایەکی، بە قەولی مەلا جەمیلی بەهەشتیی، خۆ بە پڕۆفیساوزان دانیشتبووین، یەکێکی قەرەچەناخی دەمڕەقەی گۆشت میسریی بە ناو شیووعی دەستی بە قسەی لاترِقەوچان کرد، مام هەژاری لێ وەدەنگ هات، گوتی زۆری بە تاندا بچی مەجلیسەکە بە جێ دێڵم و دەڕۆم، پێت وا نەبێ بە فڕە ئارەقێک و دوو دانە دۆڵمەی سڵقی هەولێریانە دەمم چەور دەکەی و ئەو قسە قۆڕانەتم پێ قووت دەچێ.... باش بوو خانەخوێی یەکەندەردوو بۆ سوودی ڕۆژگار هەمیشە تەیار و لەسەر تێز، یەکسەر باری قسانی گۆڕی و فەرمووی کورە چتان لەو جیدیاتانە: «بزن بر صف رندانـ هرچە بادا باد... «، ئیدی مام هەژار کەمێ



فەرهاد پیربال - ناسر حەسەن - نەوزاد مەجید - مەحمود زامدار لەگەڵ شوکور مستەفا





خاو بۆوە و لە ئاشێکی دیکەمان کرد...

مام هەژار مەلا مستەفای نەمری بە نموونە و ئۆلگوی سەرکردەیەکی کوردەواریانەی ڕەسەنی پڕ بە باڵای ئەقڵ و بیرکردنەوەی نەتەوەی کوردی لە کاروان بەجێماو دەزانی و پێی وابوو چارەی خۆنووسینی کورد، بە تایبەتی لە کوردستانی عێراقدا بەوەوە گرێدراوە. هەژار ترسنۆک نەبوو، بەڵام حەزی لەوە نەدەکرد لە عێراقێ بەر دەستی پۆلیسی نووری سەعید بکەوێ، هەمیشە خۆی لێ دەپاراستن... بەڵێ کەمیش نەدەکرووزایەوە، لێ بەلێ سەری لۆ کەسیش شۆر نەدەکرد. لە منەتی بارزانی زێتر کە قەتی منەت بەسەرەوە نەدەکرد، ئی کەسی دیکەی قبووڵ نەدەکرد. لەبۆ ژیان و گوزەرانە پڕ مەینەتییەکەی هەموو کارێکی سەخت و گرانی، تەنانەت حەمباڵی و سینی هەڵگریی ماڵە دەسڕۆیانیشی کرد... مام هەژار زۆر بە بەزەیی بوو، بەزەیی بە مندا کە لەوی زۆر هەژارتر و بێ دەرەتانتر بووم و ناچار زۆر جاران دەبوا کاری قوڕکاری و کۆڵهەڵگری بکەم، زۆر دەهاتەوە، تەنانەت بۆ مەودای یەک دوو مانگێکی بەخێوکردم: ئەو کاری بە قەولی کوردی ئەودیو، عەککاسی دەکرد و ئەمنیش کابانەتیم دەکرد، ناوبەناویش هەر بە قسەی خۆش و خەیاڵپڵاوەوە ڕۆژگاری بۆش و بەتاڵمان بەسەر دەبرد.. ئەو باسی شێوە کوردیی ناوچەی موکریانی لە شەرەفکەند و تەرەغە و کێ و کوێ بۆ دەکردم، حیکایەتی خانەقای شێخی بورهانی بۆ دەکردم، باسی فەقێیەکانی، دەروێشەکە و خاڵە مینەکەی بۆ دەگێرامەوە.. خوداوڕاستان لە ناوەندی مانگی گەلاوێژی ساڵی ٢٠٠٣دا، دە خزمەت کاک د. عەلی شەمسی نەوەی نەجیبی شێخی بورهان و ئامینە خانمی هاوسەری زۆر بەڕێزیدا دەگەڵ خانمەکەمدا مێوانداریيەکی یەک حەوتومان لێ کرا و تا دەمرم ئەو جوامێری و پیاوەتی و دڵگەرمی و کوردپەروەرییەیانم لە بیرناچێتەوە. نەمردم چاوم بە زێد و نیشتمانەکەی قازی و سەدری قازی و سەیفی قازی کەوت و چاو و دڵم بە خاکی پاکی ئارامگای شێخی بورهان (قدس سره العزیز) ڕوون بۆوە. زاخاوی مێشکم جارێکی دیکە



ئەحمەد سالار

شوکور مستەفا

شوکور مستەفا



بە یادی مام هەژاری شاعیری میللیی کورد و مام هێمنی شاعیری چاک دایەوە. لوتف و میهرەبانیی کاک سەلاح ئاشتی و کاک ئەحمەد بەحری و کاک بەهرەوەر و کاک حەسەنی کوڕی ڕەعنا خانمی خوشکی بەهەشتیی مامۆستا زەبیحی و ڕەعنا خانم خۆی و پەروین خانمی کچی و هاوسەرە جوامێرەکەی کاک ڕەسووڵ و کورە باشەکەیم هەر لەبیر ناچێتەوە. کاک ئاشتی و کاک ڕەسووڵ خۆی و کوڕەکەی و کاک حەسەنم بە خۆ و ماشینیانەوە لە مەهابادێوە تا پشت تەلبەندی سنووری حاجی هۆمەرانم دەگەڵ هاتن، زۆریان سپاس دەکەم، ئەو گیانی مێوانپەزێری کوردپەروەرییانم هەرگیز لە بیرناچنەوە... منەتباری حاجی ئیسماعیلی گادانی، برای کاک جەلیل گادانیم بەرانبەر بەو میواندارییە گەورە و گەرمەی کە لێی کردم. سپاسی هەڤالانی دەفتەری پارتی کاک عارف و بەرپرسەکەی دیکە کە مخابن نێوم بە بیرنایەتەوە و هەر وەها سپاسی کاک مستەفاش دەکەم کە ئەویشمان هەر بۆ دوعاخوازیێ دەگەڵ هات بۆ سەر سنوور و زۆری زەحمەت کێشا. سپاسی لوتف و میهرەبانیی خانم نەسرین جەوهەری بە خۆ و برایانیەوە دەکەم کە زۆریان جوامێری دەگەڵ کردم، هەروەها سپاسی کاک خالیدی ئەمینی دەکەم کە حەوت ئالبۆمی فۆتۆگرافی بۆ پڕکردمەوە. بە دیدەنیی کاک سەعید خانی هومایونی قازی و هەر پێنج کوڕەکانی و کاک مەنافی کەریمی و کاک گولابی و کوڕە باشەکەی و کاک دوکتۆری کوڕی کاک دوکتۆر عەلی شەمسی بورهان و هاوسەرەکەی، شاد و شوکور بوومەوە. هەروەها سپاسی گەرمی کاک فەتاحی ئەمیری و خانمەکەی کە دەکاتە برازای مام هێمن و پورزای کاک دوکتۆر عەلی شەمسی بورهانی دەکەم یەکەم بۆ ئەو پێشوازییە گەرمەی کە لە بۆکانێڕا لە ورمێ لێی کردم، بە ڕاستی پیاوی نەجیب هەر نەجیبە... سپاس بۆ نیوەڕۆژە خەییامانە خۆشەکەی لە بۆکان، سپاسی خانمی هاوسەری و کوڕەباشەکەی دەکەم، هەروەها جارێکی دیکەشی سپاسی لێ دەکەمەوە کە لوتفی فەرموو و دیسان لە گەڕانەوەمدا دە خزمەتی دوکتۆر عەلی شەمسی بورهان بۆ ورمێ پێشوازیی لێ کردمەوە و شەوێکی خەییامانەی دیکەمان لە ماڵی کاک ئەحمەدی قازی دەگەڵ کاکی گولابی و سەید کافی عەلەویدا پێکەوە بەسەربرد و تا مەهابادێ دەگەڵمان هات و بە دوعاخوازییەکی گەرمەوە بەرەو بۆکانێ دواماڵاوابییمان لێکدی کرد.

خۆشبەختانە بە دەم سەرەدانی پەیکەرەکەی مام هێمنەوە لە مەهابادێ بە دیداری هونەرمەندی گەورەی کورد کاک هادی شاد و بەختەوەر بووم و ئافەرینی دەستڕەنگینم لێ کرد و وێنەمان پێکەوە گرت.

با وەگەڕێمە سەروکاری مام هەژاری، مام هەژار پاش گەڕانەوەی بۆ تاران، هێندێ کاری ئەنجام داوە کە لە چوارچێوەی کاری ڕووتی وەرگێڕانی مێژوو و ئەدەبیات هەورازتر هەڵکشاوە. مام هەژار لە چێشتی مجێوردا زێتر گوزارشت لە بیروبۆچوونی شەخسیی خۆی دەرهەق بە زۆر کەسان دەربڕیوە. ڕەنگە تا ڕادەیەک ئەمنیش و هێندێ لە هاومجیزی شەخسیی مام هەژاریش هەر لەو نیگایەوە لە چرو چارەی هێندێ کەسان خۆشیمانبێ... ئەمنیش هێندێ لەو کەسانەم کە ئەو گزارەی لێ کێشاون خۆش نەویستوون، بەڵام بۆ هێندێکیانی دەگەڵ نیم، چون لە نیگای سیاسیی ڕووتەوەی خۆش نەویستوون... بەڵام ئەحمەد شەوقی گوتەنی: «واختلاف الرای لا یفسد للود قضیە»، پیاو نابێ لەسەر ناکۆکی بیروبڕوای بێ زەرەر و زیان ڕکی لە خەڵک بێتەوە...

بەش بە حاڵی مام هێمن، ماڵم قەبرە، مام هەژار دەیگۆ: «محەمەدەمینی شێخولئیسلامی لە من کوردیزانتر و شاعیرترە. تەرجەمە کوردییەکەی شەرفنانەی بەدلیسیی سێ جاران پێ پاکنووس کردمەوە، چون هەر جارە کە سیاسیی تەرجەمەکەی دەخوێندمەوە، خەرواری وردە سەرنج و تێبینیی زیرەکانەی لەسەر واژەکان، سەبک و داڕشتنی ڕستەکان.